له بلاْوكراوەكانى نوالەى نوىَ زنجيرە ( ٧٩ )

# 1377
# مەتەڵى كوردەوارى

ئامادەكردن و كۆكردنەوەى

**هۆشيار نورى لەك**

٢٠٠٧

چاپى دوانزدە ـــ بەرگى هەشتەم

# زنجیرە کتێبی نواڵەی نوێ

ژمارە (٧٩) ساڵی ٢٠٠٧



| سەرنووسەر | خاوەنی ئیمتیاز |
| --- | --- |
| ئـــاری ئـــاغـــۆك | هۆشیار نـوری لەك |
| ٧٤٥٧٧٧٦ | ٤٦٢٥١٦٩ |



| |
| --- |
| ناوی کتێب: ١٢٧٧ مەتەڵ |
| بابەت : مەتەڵی کوردەواری |
| دانەر : هۆشیار نوری لەك |
| نەخشەسازی و بەرگ: نووسینگەی (هیوا) |
| تیراژ : ٢٠٠٠ دانە |

بەرگی هەشتەم – چاپی دوانزدە/ ساڵی ٢٠٠٧

ژمارەی سپاردن (٢٢) ساڵی ٢٠٠١

لەسەر ئەرکی

سەنتەری رۆشنبیری بەهرە

بەچاپ گەیاندراوە

# بەناوی خوای گەورەو بەخشندە

## پێشەکی

نەتەوەی کورد.. خودان کەلتوورو کەلەپوورێکی زۆر دەوڵەمەندە، فۆلکلۆرێکی پاك و رەسەنی هەیە، کەچەندین لقی جیاجیای لێ دەبێتەوە، هەر لق وپۆپێکی فۆلکلۆر بەشێکی گرینگ و تێرو تەسەل پێك دەهێنێ، (مەتەڵ)یش یەکێکە لەوان، کە لەدێرزمانەوە باب و باپیرانمان کۆڕی (مەجلیس)ی دیوەخان و ماڵەکانیان پێ ئاوەدانکردۆتەوەو دانیشتنەکەی گەرم و گوڕتر کردووە.

مەتەڵ.. بۆ زاخاوی مێشك و کات بەسەربردن سوودێکی زۆری هەیە، کەسانی هۆشیارو ژیر جیا دەکاتەوە لەوانی تر، گەر یەکێ لەهەڵهێنانی (مەتەڵ) ئازا بێ، ئەوە لەدوا رۆژ ئاسۆیی پڕشنگدار و زیرەك دەبێ.

هەرچەندە ئێستا سەردەمی تەکنەلۆژیاو ئامێرە پێشکەوتووەکانە، لەگەڵ ئەوەشدا فۆلکلۆر لەبەردەوامی دەوڵەمەندی خۆی نەکەوتووە، بگرە زەوق و سەلیقەی خەڵك بۆ ئەولایەنە پاك و رەسەنە زیاترە لەلایەنەکانی تر، چونکە نەمری و راستی تێدایە، بەتایبەتی (مەتەڵ) لەزۆربەی رادیۆو (T.V)ەکان بەرنامەی تایبەتی بۆ دانراوە، گەر هەرنا گۆشەو برگەیەکی داگیرکردووە ئەمەش بوونی (مەتەڵ) دەسەلمێنێ بۆ هەموو سەردەم و کات و شوێنێ.

بۆ ئەوەی نەوەکانی ئێستاو داهاتوومان شارەزایەکی باشیان لە(مەتەڵ) هەبێ، من (مەتەڵ)ێکی بێ شومارم بۆ ئامادەو کۆکردۆتەوە

کەبەپیتی (ئەبجەد)یش دەست پێدەکات، بەوەڵامەوە، بەئومێدم توانیبم خزمەتێکی نەتەوەکەم بکەم لەم رووەوە، ئەم کتێبەش پەرتووکخانەی کوردی دەوڵەمەند بکات، بەدڵی هەموولایەك بێت.

ئازیزان.. مایەی خۆشحاڵییە کە ئەم مەتەڵانەی کۆمکردوونەتەوە، ئێستا لە وڵاتی (سوید و نەرویژ) لە قوتابخانەکان کراوەنەتە سەر زمانی ئەم وڵاتانەو لەوانەکانیان دەخوێندرێ، کەچی بەداخەوە نەوەی کورد لەو بەرهەمە بێ بەشە، بەئومێدم لەنێو نەتەوەکەی خۆمان و وڵاتەکەماندا (مەتەڵ و کەلەپوور) بە گشتی ببێتە وانەیەکی تایبەتیو سوودی لێ وەربگیرێت.

**هۆشیار نوری لەك**

| ژ | پیتی ئەلف | |
| --- | --- | --- |
| ژ | مەتەڵ | وەڵام |
| ١ | ئەسپە رەشەی چەپەرخان، بەلاقان و بەجوتان، وەڵام دەبا بۆ ئاسمان؟ | دووکەڵ |
| ٢ | ئەگەر دێ گەدایە، دادەنیشی پاشایە، کەدەڕوا بێنەوایە؟ | بەفر |
| ٣ | ئەوەچییە چییە دەست و بنی قەڵەم چییە، کەس نازانێ دەرنم چییە؟ | زووڕگ |
| ٤ | ئەم مەتەڵە بزانیت، کە پێك هاتووە لەسێ پیت. ئاژەڵە مووکەی رەشە.<br>عاشقی لاپاڵ و تاشە گەدمەیکە لاساریی، بەسەواز بێنە هاری؟ | بزن |
| ٥ | ئەشکەوتی سەد پاڵەوانان، بەقامکە پۆشەکی دەگیری؟ | شارە میروستانە |
| ٦ | ئەولای تەختە، ئەولای تەختە، ناوەڕاستی زەرنەقوتە؟ | لانك و منداڵ |
| ٧ | ئەسپی شێی کەفەلپان، دەگەرێ لەهەموو دیوان؟ | پارمیە |
| ٨ | ئەمری لەگەڵتایە، زیندووی لەگەڵتایە؟ | ئاوە |
| ٩ | ئەڕوابەڕێوە پای نییە، هاوار دەکا زمانی نییە، فرمێسك دەرژێنێ چاوی<br>نییە؟ | هەورە |
| ١٠ | ئەوەچییە، چییە چییە، گۆشتی خۆشە و مەڵەوان چیە..؟ | ماسییە |
| ١١ | (ئەسپ)یش هەیە لە دەو زۆیە ، ئالیك دەخوات بێ بڕدەکا؟ | ماشی ئاوە |
| ١٢ | ئەسپی تۆپیوو، جۆ دەخوا؟ | ئاشە |
| ١٣ | ئەو تاقە دەکا ، ئەو تاقە دەکا ، چاو لەهەموو کەس دەکا؟ | ئاوێنەیە |
| ١٤ | ئەولات تات ، ئەولات تات ، وەی بابە جیقم دەرهات؟ | ئەسپێیە |
| ١٥ | ئەوە دەی دەبرم چاکە، ئەگەر چاك نەبێ چاکە ، ئەگەر چاك بێ خراپە؟ | ئیماندار |
| ١٦ | ئەگەر بیدەی تەسك دەبی ، لێی وەرگری گەورە دەبی؟ | بیرە |
| ١٧ | ئاردی بێژراو ، هێلەگ نەدیتوو؟ | بەفرە |
| ١٨ | ئەوەی دروستی بکا بەکاری نایەنی، ئەوەی بەکاری بێنی دروستی ناکا؟ | کفنە |
| ١٩ | ئەوەچییە رادەکا هەنگاونانێ، دەوێ هەیە قسە ناکا، سەری هەیەو<br>ناگرێ ، جێگای خەوی هەیەناخەوێ؟ | رووبارە |
| ٢٠ | ئەوەچییە لەوشارە، ددان دارە وەك مشارە، هەردوو دیوی بەکارە، دەفرۆشرێ<br>بەپارە؟ | شانە، شەیە |
| ٢١ | ئاژمران و ماژمران، ئاشێك هەیە لەسەر دوازدە قوتەران؟ | سال دوانزە مانگە |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢ | ئەسپە ڕەشەی چل قەمتەرە، هەرقەمتەرەی یەك ئۆكەرە؟ | ڕەشماڵە، چادر |
| ٢٣ | ئەوە چییە لەتەیراوە دەست پێ دەكا، لەقەرات كۆتایی دێت؟ | پیتی (ت) |
| ٢٤ | ئەوە چییە وەك پیاوی سپلە، نەبەری هەیە، نە پشت؟ | نیسك |
| ٢٥ | ئەوەچییە چیچییە، بەدەستاو پێ قامچییە، خوانەبێ كەس نازانی چییە؟ | منداڵ ناوسكی دایكی |
| ٢٦ | ئەوەچییە، دۆستی خۆتە، دوژمنی خۆتە، هەرلەخۆتە؟ | زمان |
| ٢٧ | ئەوە كێیە، سەری لە پشت ئەستێرەیە؟ | سەربازی ئەستێرە لەسەرشانە |
| ٢٨ | ئەسپەو ئەسپ نییە، دوو پێی هەیەو سمی نییە، وەك ئەسپ دەڕوا گیانی نییە؟ | پاسكیلە |
| ٢٩ | ئێمە هەمانە خودانیتی؟ | خودایە |
| ٣٠ | ئاردی خوساو ئەسوڵك ئەدیتوو. | بەفرە |
| ٣١ | ئەو ولای سنلوق، ئەو لای سندوق تێدایە گەورەو بچووك. | گۆڕە |
| ٣٢ | ئەومندووكە، بەومندووكە لە پێش میوان دەڵێی بووكە؟ | چرایە |
| ٣٣ | ئەومندووكە، بە دمندووكە.؟ | ئـــۆكە |
| ٣٤ | ئەو خواردنەی هەتا دووجار نەكوڵێت، ناخورێت؟ | ساوارە |
| ٣٥ | ئەو لای تانە، ئەم لای تانە تێدایە دوو پوور مرجانە؟ | چـاوە |
| ٣٦ | ئەگرە مێنێ وەكو هەور فڕێ دەدات سپی چەور؟ | مەشكـە |
| ٣٧ | ئەخزێ و ناخزێ هەڵمەت دەبا بۆكوژێ، دانی نییە بیگەزێ؟ | مەشكەیە |
| ٣٨ | ئەولای دارە ئەولای دارە، ناوەندی خڕ خڕەی گوێ بەگوارە؟ | بێژینگ |
| ٣٩ | ئاسنی بەیێونێ، داوێنە پشت ستونێ؟ | پێمەرە |
| ٤٠ | ئاگری نییە ئەسوتێنێ، گیانی نییە ئەتپشێنێ؟ | تیشكی خۆر |
| ٤١ | ئیشت پێی بێ فڕێی دەدەی ئیشت پێی نەبێ هەڵیدەگری؟ | تۆڕی ڕاو |
| ٤٢ | ئەگەر بڕوا ناگەڕێتەوە؟ | تەمەن |
| ٤٣ | ئاڵەم دۆڵەم، شەش پێی دوو سم، پۆپیتەت دەگرم، پێت دا دەفسم؟ | تەرازوو |
| ٤٤ | ئاسنی سەرزەق، لەسەر تەختی ڕەق، بەدارێكی ڕەق دەكاتن لەق لەق؟ | تەشی |
| ٤٥ | ئەوە چییە چی پێنەرێن، عەبا نارنجی پێنەرێن، پەپكە بەكونجی پێدەرێن؟ | تەماتە |
| ٤٦ | ئەگەر ڕەش بوو خاوێنە، ئەگەر سپی بوو پیسە؟ | تەختە ڕەش |

| ژ | مەتەڵ | وەڵام |
|---|---|---|
| ٤٧ | ئەولای پەرژین، ئەولای پەرژین، تێیدایە کۆترێکی نەخشین؟ | چـاو |
| ٤٨ | ئەستێرەی ناو مەنجەڵی، بە رۆژ لە دەرێ بەشەو لە غەرێ؟ | چـاو |
| ٤٩ | ئەگەر عەقڵت بێ عەقڵ بەهەشتە، شەش پەرو دووشاخ، پەپوولەی دەشتە؟ | پەپوولە |
| ٥٠ | ئاسنی دوولولە، پێی پیانێ لێیکەرە قوڵە؟ | فرۆکە |
| ٥١ | ئەوەچیە لەئاسمان دەبیندرێ، لەزەوی نابیندرێ؟ | پیتی (س) |
| ٥٢ | ئەرۆم لەئەبڕاوی، دێم لەئەڕواوی سوار بم لەئەزاوی ؟ | ڕێگە، خۆی، هێستر |
| ٥٣ | ئەوەچیە لەقرنێک یەک جار دەبیندرێ، لەدەقیقەیەک دووجار؟ | پیتی (ق) |
| ٥٤ | ئەولای دارە ئەولای دارە تێیدا دوو گوێچکەی هارە؟ | خەنجەر |
| ٥٥ | ئاخور خوارەگای هارە؟ | خەنجەر |
| ٥٦ | ئالتان ماڵتان، زاوای خاڵتان، هاتە ماڵتان، چی دەدەیێ؟ | دایکم |
| ٥٧ | ئەتبەمە لانە کەحاسێ، دەکوێنێت کوتم لولیا داسێ؟ | دەستار |
| ٥٨ | ئەشکەو تۆکە، پڕ بەردۆکە؟ | دەم و ددان |
| ٥٩ | ئەولای دیوار ئەولای دیوار تێیدایە سەگێکی هار؟ | زمان |
| ٦٠ | ئەگەر زۆرە کەمە، ئەگەر کەمە زۆرە؟ | مانگ |
| ٦١ | ئەولای کەلەک ئەولای کەلەک، ناوەراستەکەی چەرخ و فەلەک؟ | زمان |
| ٦٢ | ئاگری خۆری بەر سێبەر، سەرتاپای کفنی لەبەر؟ | زستانە |
| ٦٣ | ئاوی پێداکەی تەر نابێ، شیری لێدەی شەق نابێ؟ | سێبەر |
| ٦٤ | ئاوی پێدادەکەی تەڕ نابێ خەنجەری لێدەی شەق نابێ؟ | سێبەر |
| ٦٥ | ئەولای گلە ئەولای گلە، ناوەراستەکەی فینکی دڵە؟ | شەربەی ئاو |
| ٦٦ | ئەوە چیە ؟ چیایە، لەسەر چیای گیایە، لەسەر گیای چرایە؟ | قەندنە |
| ٦٧ | ئاسن و بەن گلۆڵە، تێم یەخست ڕەشی دووڵا، لێم خوری کردیە قوڵە؟ | کارگەی جۆلا |
| ٦٨ | ئەو کوڵە ڕەشە بەتۆوەوە، ئەو مژانەی بە منەوە، خۆم تێکوتا بە گۆنەوە، زیکە زیکەی لە بنەوە؟ | کارگەی جۆلا |
| ٦٩ | بەرهەسانی پشت خوری گەر نەزانی لەبەرم مری؟ | کلاشی پەڕۆ |
| ٧٠ | ئەولای شاخ، ئەولای شاخ، پێیدا دێت چورچەی بەیداخ؟ | کیسەڵ |

| | | |
|---|---|---|
| ٧١ | ئەرزی سپی بەجۆ دەکەم ، بەدەو دەیچێنم ، بەدەست دەیدروورم؟ | کاغەزو پێنوس |
| ٧٢ | ئەگەر پربێ ناتەواوە ، ئەگەر ناتەواو بێ پرە؟ | مانگ |
| ٧٣ | ئەوە چییە، تۆ دەیبینی، ئەوتۆ نابینی ؟ ئەو قسە دەکا، تۆ قسەناکەی؟ | تەلەفزیۆنە |
| ٧٤ | ئاڤە، ئاڤ نیە، ئاڤدا ماری مرییە، سەروا قەسری زێرییە؟ | چرایە |
| ٧٥ | ئەم ژ بازاری دکرین یارەش، ب کار دئینیت یاسوورە، داهاڤێژین یابۆرە؟ | رەژوو |

| | پیتی ( ب ) | |
|---|---|---|
| | مەتەڵ | وەڵام |
| ٧٦ | بنی سەوزەو گەڵای دار نییە، چواردەوری سپییە و بەفر نییە، ناوی زەردەو رۆژ نییە؟ | گوڵەنێرگز |
| ٧٧ | بەچوار لاقە، بەهەشتان گونیە، لەسەرێی باری کەرێی کایە؟ | کەپر |
| ٧٨ | بەهاران شینە، هاوینان وشکە، کەسیش بەبێ ناو نازێ؟ | گەنم |
| ٧٩ | بەدەرکێکدا دەچییە ژوورێ، بەدواندا دێیە دەرێ؟ | شەروال |
| ٨٠ | بەدەست دەچێندرێ، بەچاو هەڵدەگیرێتەوە؟ | نوسین |
| ٨١ | بارانی بێ با، چییە... | فرمێسکی چاو |
| ٨٢ | بەهەموو شوێنێکت دا دەبات، هیچ مەسرەفت لێ ناکات؟ | خەون خەیاڵ |
| ٨٣ | باوکی پۆڵایە، دایکی ئاسنە، بیچۆ یان دەبێ وەك دەنکی هەنار؟ | تفەنگ |
| ٨٤ | بەحری شینە، ئاوتێنینە؟ | ئاسمان |
| ٨٥ | بەرد دەك لەسەر بەردەکێ، تەیرەك دەخوێنێ لەکۆرتەکێ، کونێ قونێ لەنێوەکێ؟ | دەستاڕ |
| ٨٦ | بەرۆژکۆکە، بەشەو پەرش و بڵاوە؟ | نوین |
| ٨٧ | بەرۆژ دەنوێ، بەشەو کاسبی دەکا؟ | شەمشەکوێرەیە |
| ٨٨ | بەمردووی ژیان دەکا؟ | دوو پشك و قرژاڵە |
| ٨٩ | بکی دەڕوا، سەری ئارەوا؟ | ئاوو پردە |
| ٩٠ | بەگوێی ئەنگە، لەبەژنی ئەنگە، مێردی کۆڵانی تەنگە؟ | هەرزنە |
| ٩١ | بەمنداڵی سپییە، بەگەنجی سوورە، بە پیری رەشە؟ | ترێی رەشە |
| ٩٢ | باوکی ئاوە، دایکی خۆڵە، منداڵێکی خەپە تۆڵە...؟ | دوومبەڵانە |
| ٩٣ | بازرگان هات بەلەنگە لەنگ، کوتاڵی هێنا لەهەموو رەنگ؟ | بەهارو گوڵە |
| ٩٤ | بێ رەنگو بێ بۆنە، مرۆڤ بێیوی لەچوونە...؟ | ئاوو هەوایە |
| ٩٥ | بەدوو ئەشکەوت ، دیوارێکیان هەیە؟ | لووت- کەپوو |

| ٩٦ | بانی خورییە، بنی پەرۆیە، ڕۆیشتنی لەسەرخۆیە؟ | کلاشی پەرۆیینە |
|---|---|---|
| ٩٧ | بزنە بەلەجار، لەسەر بەردی غار، هۆ هۆی لێدەکەن ... نایێتە خوار؟ | هەورە |
| ٩٨ | بەتەرێ تێدەخەی، بەووشکی دەریدەکەی؟ | نانە |
| ٩٩ | بەگزادەی هەڵدەن، جووتێ خانی هالەکەردن؟ | باگووردانە |
| ١٠٠ | بنی دارە، نیوەی تارە، سەری ئاگرە، بەزیانە؟ | جگەرەو دارجگەرە |
| ١٠١ | بەهاوین و بەزستان، بووکە بارانەی زستان؟ | کلاوە |
| ١٠٢ | بۆ هەسانی سەرخوری، ئەگەر نەزانی لەبەرم بمری؟ | کلاش |
| ١٠٣ | بە دەیان هەڵیدگری، بە پێنجان تێدەنێی، بەسێ و دوو دەتکێنی، بەیەکی مالوی دەکری؟ | پاروو |
| ١٠٤ | بشمری لێت نابێتەوە؟ | ئاوە |
| ١٠٥ | بیهاوێیتە پشت حەوت شاخان ناشکێت، بیهاوێیە ئەشکەوتێکی تاریکەوە دەشکێت؟ | قەزوان |
| ١٠٦ | بنی قیامەتە، سەری رەحمەتە؟ | سێری نانە |
| ١٠٧ | بانی تاوێرە، بنی تاوێرە، لێی مەترسە وپێی بوێرە؟ | کیسەڵ |
| ١٠٨ | بەبەرد دروست دەکرێت، بەبەردیش دەشکێ؟ | شووشەیە |
| ١٠٩ | بەچاران دەخشێ، بەدووان دەروا، بەسێیان دەلەنگێ؟ | مرۆڤ بە (منالی گەنجی، پیری) |
| ١١٠ | بەرمو بایە، روو لەخوایە؟ | کۆلارەی منداڵانە |
| ١١١ | بەری هەسانە پشتی خورییە، بەرۆژ تێرە، بەشەوبرسییە؟ | کلاش پەرۆیە |
| ١١٢ | بان گۆشتە، باگوردان ئاسن؟ | سەرو مەکینەی سەرتاشین |
| ١١٣ | بەخۆی مردییە، هەموو دونیای لەبەردەستییە؟ | خامە، قەڵەم |
| ١١٤ | بێری چارکچی هەیە، هەرکچەکی شەش کوونی هەیە، هەرکونەکی مێرەکی هەیە؟ | کون و بزماری نالی ولاغ |
| ١١٥ | بێ قاچ و باڵە، کەدەمری گۆشتی حەڵاڵە؟ | ماسییە |
| ١١٦ | بەدەوری پیرو پێشان، بزن لەسەر گامێشان؟ | پێڵاوە |
| ١١٧ | باوێ یە ئاوی تەرنابی، باوێیە ئاگر ناسوتێ؟ | تیشکی خۆر |
| ١١٨ | بەپیسی دەخوری، بەپاکی ناخوری؟ | سەگ لەکاتی گەری |
| ١١٩ | بازێرە دەنگی ژێ ناهێت، سیکە بازاری ژێ ناهێت ؟ | گۆرستانە |
| ١٢٠ | بەموو لەبێ موو پەیدا دەبێ، بێ مووش لە بەموو پەیدا دەبێ؟ | هێلکەو مریشک |

| ١٢١ | بەیەك شەو داسە ، بە دوو شەو ئەلماسە، بەسێ شەوی خرپاشە؟ | مانـگ |
|---|---|---|
| ١١٢ | بنی بیبە، سەری شاخە، ئاوی ئاسنە پڕ لەزاخە؟ | خەنجەر |
| ١٢٣ | بەگزادەی هەڵدنی، جووتێ خاڵی لەگەردنێ؟ | باگووردان |
| ١٢٤ | بەدەست شێرە، بە پێست پلینگە؟ | بزق |
| ١٢٥ | بەسنلوقێ هەشت ڕۆخان، تیایتی لە پیر و جوان؟ | گۆڕستان |
| ١٢٦ | بەرمق وەك دارە، لووتی زۆر خوارە؟ | نۆکە |
| ١٢٧ | بەنەمری خودا، بەنەقلی بەنلە بنچکە لەسەر بنچکە بەنلە؟ | هەوجارو گاجووت |
| ١٢٨ | بەسەرپێ ڕێ ژن، بەچەنگ مناڵە، بەپشتی ڕوستەم، ئەتەوەی زاڵە؟ | سیغورە |
| ١٢٩ | بەسێ برا قاچێکیان هەیە؟ | پالکە |
| ١٣٠ | بەچوار برایان تفەنگی داونە گۆمیکی؟ | گوانی ئاژەڵە |
| ١٣١ | بەخێشەوە بە میشەوە،بەو خالیقی دەروێشەوە، پەنجە لە پشت پانی لە پێشەوە؟ | کللۆ |
| ١٣٢ | بەرجوکەی قالب مەزن ، ئەگەر نەزانی ببیە بزن؟ | دار گوێز |
| ١٣٣ | بە خۆی لە چەمایە ، خەرجەی لە گوندایە؟ | ئاشی ئاوە |
| ١٣٤ | بەحری شینە، دوو پاپۆڕی لێدابەزینە، یەك ئەسپە یەك ماینە؟ | ئاسمان و ڕۆژ و مانگ |
| ١٣٥ | بۆرە وەك ماری بۆقە پێت ئازێم؟ | بۆق |
| ١٣٦ | باخی کەس نەخەملاندوو؟ | بەهەشت |
| ١٣٧ | بالای وەك عامود سەر تاپای ڕەشە ، سەریشی پانە وەك سەری قەشە؟ | پەلکەدار |
| ١٣٨ | بە زمانی پێغەمبەران بیستوومە لە عەقڵ بەسەران بابیش نێرە و دایکیش بەران؟ | ئادەم و حەوا |
| ١٣٩ | بەشەو وەك قیرە، تیژە وەك تەیرە، سپی یە وەك شیرە؟ | چـاو |
| ١٤٠ | بە گرۆکەیەك چاوە هەموو مالان گەڕاوە؟ | دەرزی |
| ١٤١ | برایەك هەیە لە دەشتێ سەد و سێ و دوو کون لە پشتێ؟ | ڕەشکەکێشان |
| ١٤٢ | بەدەیان گێژەوی دەکەن، بەسێ و دووان گێرەی دەکەن یەکیان دەچالێنەکەن؟ | نانخواردن |
| ١٤٣ | بەپیسی دەخورێ، بە خاوێنی نا خورێ؟ | سەری مرۆڤ |
| ١٤٤ | بە سەدو یەك برایەك ریخۆڵەیان هەیە؟. | تەزبیح |
| ١٤٥ | بیرێکم هەیە حەزیایەکی تێدایە گوڵێکی گەشی بە دەمەوەیە؟ | چـرا |
| ١٤٦ | بەفرە ئاوی نییە ، دارستانە داری نییە؟ | نەخشـە |
| ١٤٧ | بەهاوین و بە زستان دایەکوتن بە کوڵەمستان؟ | هەویر شێلان |
| ١٤٨ | بەرگی زاقتان ئەم لە نێستران بردم بۆ کافران؟ | توتن |

| ١٤٩ | بەسەر سەوزم . بەلەش رەشم لەناو دلّدا سپی و گەشم دەبزانە لەکام بەشم؟ | باینجان |
|---|---|---|
| ١٥٠ | بێ ئەرتالە خۆی سوێرە داسی خوارە؟ | هەڵبەتە وایە |
| ١٥١ | بەسەر پێنجە. بە روح چوارە. بەپا هەشتە؟ | چوار مرۆڤ و مردوەکی ناودارە بازە |
| ١٥٢ | بە بەرخی سپییە. بەشەکی سورە . بەمەڕی ڕەشە؟ | ترێ |
| ١٥٣ | بەشەو دەڕوا مەنلۆك ، بەرۆژ دەڕوا مەلدۆك. مەنلۆکە لاق تیژکە؟ | ڕووبار |
| ١٥٤ | بە دایە وێ ناکەوێ بە بابە وێ دەرناکەوێ؟ | منداڵ کە فێری وشەی بابە دەبێت |
| ١٥٥ | بە جاحێلی ریشی سپییە بە پیری ریشی ڕەشە؟ | ترێ |
| ١٥٦ | بەگەرمایە جل دەکرێت بەسەرمایە رووت دەکرێت؟ | سێری نانکردن |
| ١٥٧ | بەپری و بەبەتالی یەك کێشی هەیە؟ | غربێتی کامێت |
| ١٥٨ | بێ ڕەنگە ، بێ مەرگە ، بێ دەنگە؟ | با ( هەوا ) |
| ١٥٩ | بەری بەنە ، پێت نارنم؟ | بەری بەن |
| ١٦٠ | بەدەست شێرە ، بەپێست پڵینگە ، بەچاو بازە؟ | بۆقـە |
| ١٦١ | بەسەد و یەك برا، ریخولەیەکیان هەیە؟ | تەزبیح |
| ١٦٢ | بەرمیلی کە پوو درێژ پێویستە لە بۆ دەست نوێژ؟ | مەسینە |
| ١٦٣ | بەشەش لاق، بە لاقێکی دا شەرمی ولاتێکی دا؟ | تەرازوو |
| ١٦٤ | بنی ڕەشە قیامەت ، سەری مۆرە سەلامەت ! | تەندور |
| ١٦٥ | بنی قوڕە قیامەت ، سەری سۆرە عەلامەت . سەلی عەلا موحەمەد؟ | تەندوور |
| ١٦٦ | بان لە بان دارە ، ئاسن جلەو دارە؟ | تەشییە |
| ١٦٧ | بنی دارەکە. لەسەر گۆزەپانەکە . لە سەرویش گۆپارەکە؟ | تەشییە |
| ١٦٨ | بازنی خوچە هەمینی. کەوتە ژێر زمینی ، دەنگی گەییە مەدینی؟ | تفەنگ |
| ١٦٩ | بابی پۆلایە ، دایکی ئاسنە. بێچویان دەبێ وەك دنکە هەنار؟ | تەفەنگ |
| ١٧٠ | بە جاحێلی سپییە ، بە پیری رەشە؟ | ترێیە |
| ١٧١ | بیگری قیچەکە ، بەری دەی دنیایەکە؟ | چاو- نەوەس |
| ١٧٢ | بەگزادەی جلك بووزی؟ | چەڵتوك |
| ١٧٣ | بەقەد مشتێکە ، پڕ بەژووریکە؟ | چرا |
| ١٧٤ | بای پولیکە، پڕ مشتێکە؟ | چرا |

| ژ | مەتەڵ | وەڵام |
| --- | --- | --- |
| ١٧٥ | بیرێکم هەیە ، حەزیایەکی تێدایە گوڵیکی گەش ، بە دمیەوەیە؟ | چرا |
| ١٧٦ | برایەکم هەیە لە دەشتێ ، ژن دەهێنەوە بە پشتێ؟ | خرنوك |
| ١٧٧ | بەکنی دا دەرۆی کفرە، دەستی لێدەدەی کفرە، سەیری دەکەی کفرە؟ | دار کفرە |
| ١٧٨ | بە هاوین پۆشتەو پەرداخ ، بە زستان رووت و رەجال؟ | دارو د[illegible] |
| ١٧٩ | بەشەو وەك قیرە ، تیژە وەك شیرە ، سپیە وەك شیرە ؟ | چاو |
| ١٨٠ | بلندە وەك حوشتر ، شیرینە وەك شەکر؟ | دار توو |
| ١٨١ | بێ تەرتاڵە؟ | دار بییە |
| ١٨٢ | بەدەسکی حەمەدۆکی، لەهەموو دەرکان دەکۆکی ؟ | دیــت و دۆڵ |
| ١٨٣ | بەرانیکم هەیە لە دەشتێ، پنۆك پنۆك لە پشتی هەرچی لێی نەدا ناچێتە بەهەشتی؟ | د[illegible]ست |
| ١٨٤ | بەرۆژ دەڕوا عوولە پێ، بەشەو دەڕوا عیولە پێ، تەیری بەبار نایگاتێ؟ | رووبار [illegible] |
| ١٨٥ | بیری بە پەڕۆ ، کندری بە دەرزی ، دۆلکی شاخ؟ | ر[illegible] |
| ١٨٦ | برایەك هەیە لە دەشتێ سەدو سی و دوو کونی لە پشتێ؟ | رەشكەو [illegible] |
| ١٨٧ | باخی دری، ، بەرگی دڕی، دەستەکۆلەی سارەو سڕی؟ | ز[illegible] |
| ١٨٨ | بەگەرما جلی دەکەن ، بەسەرما رووتی دەکەن؟ | سێرۆ [illegible] |
| ١٨٩ | بەسەر کافرە ، بە پێ منداڵە ، بە تیروکەوان ، رۆستەمی زارە؟ | سیخور |
| ١٩٠ | بەرۆژ لەگەڵت دەروات ، بەشەو دادەنیشێت؟ | سێبەر |
| ١٩١ | بزنە گەرێ، هەڵدەگەرێ ، دادەگەرێ ، ناڵەوەرێ؟ | سێبەر |
| ١٩٢ | بەنیشەو بە میشە، بەفەقێ و دەروێشە ، قونپانی لە پێشە؟ | شێرە کلۆیە |
| ١٩٣ | باڵندەو شیردەرە؟ | شەمشەمە کوێرە |
| ١٩٤ | بە دوازدە برا ، سێ دڵیان هەیە؟ | کاتژمێر |
| ١٩٥ | تۆوی لەبەردی ئاسنی لە شاخی زەوی لە گۆشت؟ | کلی چاو |
| ١٩٦ | بە زەمانی پێغەمبەری ، شاخێکی لە تەوقی سەری؟ | کودی |
| ١٩٧ | بەخەت خەتێ ، پشت خێوەتێ ؟ | کوارگ |
| ١٩٨ | باڵی نییە دەفڕێ ، گۆشتی نییە دەخورێ ؟ | کەنگر |
| ١٩٩ | بیرەکەم هەیە لە پێستی غارا ، لە باتی ناو بەردی تێدایە ، دولکی داری تۆ دروست کرایە ، ئەوی زانی خەرات کرایە؟ | کل و کلدان و کلچوکە |
| ٢٠٠ | بەدەوری پێغەمبەری ، کلك لە توقی سەری؟ | کلوە |
| ٢٠١ | بە [illegible] مەلە، بەشاخ گایە ، ماسی پشتەو هەر بایە؟ | کوڵلە |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٠٢ | بلورمه . له بن نێسکان چەرمه؟ | کیسەڵ |
| ٢٠٣ | به سەد برایان ، مێزەرێك؟ | گێسك |
| ٢٠٤ | به رۆژ کابانه ، بەشەو میوانه ؟ | گێسکه |
| ٢٠٥ | بەرۆژ عەیاره ، بەشەو بووکه؟ | گێسکه |
| ٢٠٦ | بنی قورینه ، ناوی قەوی بەفرینه، سەری زێرینه ؟ | گەنم و لاسکه کەیتی |
| ٢٠٧ | به خوێ نوستیه ، نەسپی مردیه؟ | منداڵ و لانکه |
| ٢٠٨ | بارەکەی زیندووه ، کەرەکەی مردووه؟ | منداڵ و لانکه |
| ٢٠٩ | برایەکم هەیه له زووری ، سەری گەورەتره له هووری؟ | مێروستان . |
| ٢١٠ | بێلاق و بێ باره ، له ڕاکردنیش ، بەغاره، هێلکه دەکات ماره؟ | مـار |
| ٢١١ | به چوار پەلان سەما دەکا ، خواردنی میو حاکم پەیدا دەکا؟ | مێش هەنگوینه |
| ٢١٢ | بەکاری دێنی ، فرمێسك دەڕژێنی؟ | مـۆم |
| ٢١٣ | بەرخۆکەی سەرچیا ، ناهێلی قلەی گیا؟ | مەکینەی سەرتاشین |
| ٢١٤ | بەناو نلو دادەبڕا ، پێی تەڕ نابی ؟ | منداڵ لەنلو سك دایکی |
| ٢١٥ | به تەڕی تێلەکەن ، به وشکی دەریدەهێنن؟ | نالی فرنـی |
| ٢١٦ | بستێکه دوو سەد کیلۆ هەڵدەگری؟ | ناڵ |
| ٢١٧ | بۆ خۆی سەنگینه و سەد سەنگ سواریەتێ ، گیان لەبەر نیەو گیان لەبەر سواریەتی؟ | ناڵ |
| ٢١٨ | به رۆژ ڕازاوه ، بەشەو رووتاوه؟ | نوین |
| ٢١٩ | بالای سەوزه ، رووی سپییه ، چاوی زەرده؟ | نێرگز |
| ٢٢٠ | به دەوری ئەسحابان، کور گەورەتره له بابان؟ | هێستر |
| ٢٢١ | بەکەرێ ، به ماکەرێ ، به جاشکی لەبەر کەرێ ، چەند قاچیان هەیه؟ | هەشت |
| ٢٢٢ | بەری هەسان، پشتی قورنان؟ | کوارگ |
| ٢٢٣ | بەتەواوی ناتەواوه ، بەناتەواوی تەواوه؟ | مانگ |
| ٢٢٤ | بازنی ستی یێ ، هاڵێت کانیێ ، شەقەدا ناماینیی؟ | مانگ |

| | پیتــــی ( پ ) | |
|---|---|---|
| | مەتــــــــەڵ | وەلام |
| ٢٢٥ | پشتی ڕەشە دەرپێی قیرە، بەرزەکی سپییە دەری شیرە، ڕێی دەکا دەری کورە وەزیرە ؟ | حاجی لەق لەق |
| ٢٢٦ | پانکیلەی پانکیلانێ، دەچنە گردۆلەکان، دەهێنن گولەکەکان؟ | شانە |
| ٢٢٧ | پشتی ناجوڵێ، بەخۆی دەجوڵێ؟ | کیسەڵ |
| ٢٢٨ | پێش میوانێ، دەچێتە بنەبانێ؟ | با، هەوا |
| ٢٢٩ | پەتکی ئاو دەدەن، گوڵک مەزن دەبێ؟ | کودی، شفتی |
| ٢٣٠ | پشتۆکەی لەپشتێیە، هەموو مالان نیشی پێیە؟ | گێسك |
| ٢٣١ | پەنجا کەسی سپی لەژوورێك درێژ بوونە، سەریان زەردو سوورو قاوەییە؟ | دنکە شخاتە |
| ٢٣٢ | پیاوێك بەسەعاتێك چووە حەج و گەڕایەوە؟ | سەعاتی دەست |
| ٢٣٣ | پیرەمێردی کەلەشتی، دەرمانی هەمووشتی؟ | خوێیە |
| ٢٣٤ | پیستی مەڕە، بازنی خڕە، پەنجەی لێدەی دەنگی پڕە؟ | دەف |
| ٢٣٥ | پوورەکم هەیە لەکێوی، بەرپان هێلکە دەپیووی؟ | کەوە |
| ٢٣٦ | پێنج فەرزی، بێ بیسمیلا؟ | بانگدانە |
| ٢٣٧ | پشتی رەش، ناوسوورە؟ | زۆرپەی دارە |
| ٢٣٨ | پزۆکەی بکەوە، لێی بەریە؟ | گیپەیە |
| ٢٣٩ | پێت خۆشە، جاعێلی ماڵ بێت ؟ | سەگە |
| ٢٤٠ | پڕ بە بارە لەهەموو شوێن دیارە؟ | ناو |
| ٢٤١ | پێنەفەو پێنەف نییە، پێیدا دەدەن ئاگای لێ ی نییە؟ | باگووردان |
| ٢٤٢ | پلەکە قازێ، لەهەموارێ، لۆ دەنازێ؟ | بەفرە |
| ٢٤٣ | پیاوێك لەدایك نەبووە، مردووە، یەکێکیش لەدایك بووە نەمردووە؟ | باوکە ئادەمە، حەزرەتی عیسا |
| ٢٤٤ | پیرە مامی لە تەلانی ، تیران داوێ بێ کەوانێ؟ | سیخوڕ |
| ٢٤٥ | پێنج مانگ بە حریەیە، بە خۆی حاکمە ، بەرگی بووزی یە؟ | برنج |
| ٢٤٦ | پڕ بەدەست دەیگری، دوای سەری دەبڕی، هەر بۆ خۆت لۆی دەگری | پیاز |
| ٢٤٧ | پێنەچیەکی دەست ڕەنگێن ، هەشت پێتەو دەنوختە نوسێن، دەرگایەکی | پەنچەرچی |

| | | |
|---|---|---|
| | پێویستە بۆ ئۆتۆمبێل و ماشێن؟ | |
| ٢٤٨ | پیرەژنێ گمە گمە ، لێیهەڵدەن سمرە سمە ، پیسکە ئەوە جاجمە؟ | جاجم |
| ٢٤٩ | پیکەوە دەگرێن، پێکەوە دەجولێن، لەیەکتری جوودان؟ | چاو |
| ٢٥٠ | پشتی لەخواروو دەستی لەحەوا، بزن هەی بزن، باری تەعەلا؟ | مەشکە |
| ٢٥١ | پر بەچنگێکە هەنارنییە، پیشەی هەیە لەبازاری نییە؟ | دڵ |
| ٢٥٢ | پایزێ دەیکوژنەوە، زستانێ خینی لێ دێ؟ | دارو خەڵوزە |
| ٢٥٣ | پاسەوانی بەکارە، لە پشت دەرگاو دیوارە، بەسەرمایێ زۆر هارە؟ | سەگ |
| ٢٥٤ | پالکی لەسەر پالکێ دەست بەلکێ؟ | دەستار |
| ٢٥٥ | پەچەی رەش و بزنی جێگای؟ | ساج و برێشکە |
| ٢٥٦ | پیر پرنێ ئاو دەلۆکی لە هەموو کوڵانان دەکۆکی؟ | دەهۆل |
| ٢٥٧ | پێستی لە ناو گۆشتی لە دەرە؟ | سیقەتۆرە |
| ٢٥٨ | پالکی لە پانەکان ، ئەچێتە گۆنۆلەکان ، ئەمێنی خارە گۆلەکان؟ | شانەیە |
| ٢٥٩ | پەلکی لەوێ کەوتووە، تەرکی لەوێ کەوتووە؟ | شفتی |
| ٢٦٠ | پەم پای دووگوێ؟ | گوێ |
| ٢٦١ | پێنجە نابێ بە شەش؟ | فەرزەکانی ئیمان |
| ٢٦٢ | پێنج برا یەك کلاویان هەیە؟ | قولکاوەر |
| ٢٦٣ | پەرێزی سپی، گوڵی سیاوە ، ئاودێری قامیش، وەزێری پیاوە؟ | کاغەزو قەلەم |
| ٢٦٤ | پیرە بابی لە غەرێ ، بەرنێنی ئەرێ بەرێ؟ | کەلەشێر |
| ٢٦٥ | پشتی تالەوتات نییە ، بەری سانەوسان نیـیە، گیا دەخوا مانگا نییە؟ | کیسەڵ . |
| ٢٦٦ | پشتی رەقە بەرد نیـیە هێلکە دەکا مریشك نییە سەری درێژە مار نییە؟ | کیسەڵ |
| ٢٦٧ | پیستی هەیە مووی نییە، خواردنی هەیە، ریفی نییە؟ | گەنە |
| ٢٦٨ | پیرەژنێ لورە لورە ، لێیدەن بە بەرد زوورە ، پیسکە [illegible]و مافورە؟ | مافوور |
| ٢٦٩ | پێتەوە ئەنێنن و لێت نابێتەوە؟ | نـــاو |
| ٢٧٠ | پشتی سەوزی کەشیدە سپی؟ | نێرگز |
| ٢٧١ | پاشازادەکەی کەچەی شار ، لە گوڵ بووە و لەناو گوڵزارە بێ بۆنی گوڵ ناچێتە شار؟ | هەنگ |
| ٢٧٢ | پیرە مێردێ قون بەمەشکی چییە؟ | سۆبەی دار |

| | پیتــــی ( ت ) | |
|---|---|---|
| | مەتـــــــەڵ | وەڵام |
| ٢٧٣ | تولان داوی مێو نییە، پێوە دەدا مار نییە، هەرمێ دەگری دار نییە؟ | تەزو عەمودی کارەبا |
| ٢٧٤ | تانجیە ڕەشی دەم هەراسی، خێوو خاوەنی ناناسی؟ | تفەنگ |
| ٢٧٥ | تەیرا زمزمێ، پڕ لەنانی گەنمێ؟ | گوێزە |
| ٢٧٦ | تەختە لەبن تەختە، حاجی بێ بەختە؟ | خەنجەرو کاڵانە |
| ٢٧٧ | تاسی زڕ زڕ، دای لەبڕبڕ، کۆڵەکەنەو بەغدارەوی؟ | تەلەفۆن |
| ٢٧٨ | تاقە دارێکە، پڕ بەشارێکە؟ | قزناغە |
| ٢٧٩ | تانجییە زەردوو، لەکونا مردوو؟ | ڕۆنی ناوهێزمیە |
| ٢٨٠ | تشتی من تشتانە لەبەیانی تائێوارە خوڵ بەسەر خۆی دادەکا، کەدێتەماڵ لەبووکی ماڵەکە جوانترە؟ | گێسکە |
| ٢٨١ | تۆ سەرم بەچەقۆ دەبڕی، کەدەمرم لەتەکما دەگری ؟ | پیازە |
| ٢٨٢ | تشتێ من تشتە، بێ بەرو پشتە؟ | نیسکە |
| ٢٨٣ | تشتێ من تتشەلە هنگڤین شرنترە لناسن گرانترە؟ | خەو |
| ٢٨٤ | تانجی یە ڕەشی ئەلقە لەگوێ، دەوان دەوریە لەدەور دێ؟ | ساج (سێڵ) ناکردن |
| ٢٨٥ | تێناني سونەتە، لەقانلنی واجبە؟ | ئەنگوستیلەیە |
| ٢٨٦ | تەپ تەپ دەکا، ڕەپ ،ڕەپ دەکا، لەمێوانم شەرمزاردەکا؟ | دڵۆپەیە |
| ٢٨٧ | تەڕووە دەچێتە سەربانی، گەرم دەبێتەوە، دێتە خوارێ؟ | نانی ساج |
| ٢٨٨ | تیژە وەك تەیر، ڕەشە وەکو قیر سپیە وەکو شیر؟ | چلو ( پەرە سیلور ) |
| ٢٨٩ | تالە شیرین نییە، پڕچنگە هەنلرێ نییە حەز ئەکا قازی نییە حوکم ئەکا حاکم نییە؟ | دڵە |
| ٢٩٠ | تۆ دەیبینی، ئەونابینی، تۆ قسە دەکەی گێی لێنییە،ئەوقسە دەکا گێت لێیە؟ | تەلەفزیۆنە |
| ٢٩١ | تویلە تەڕێ لەبن بەڕێ ،هەر هەڵلەپەڕێ ئەرا ئەروا زۆر خێرو شەڕێ؟ | ماسیە |
| ٢٩٢ | تەختێ ڤێن، پاشای زێڕین؟ | ئاسمان |
| ٢٩٣ | تا کەرم بەستەوە ، جاشك بەسەربانی کەوت؟ | ئاگرو دووکەڵ |
| ٢٩٤ | تا سەرێ نەبڕیت قسە ناکا؟ | پێنوس |
| ٢٩٥ | تا نیوەی دەست ڕەش نەبێت ، تامی دەمت خۆش نابێت؟ | خواردنی گوێزی سەوز |
| ٢٩٦ | تەتە کولکێ تەتە نەکولکێ تەتە زایە کولکێ؟ | جووجلە، هێلکە، مریشك |

| ٢٩٧ | ئالیٔ دەبڕێ گەورە دەبیٔ ، تا تێی دەکەی بچووك دەبیٔ؟ | چــالٔ |
|---|---|---|
| ٢٩٨ | ترشە وەك هەنار ناسکە وەك خەیار؟ | رێواس |
| ٢٩٩ | تەری دەکەی و بەلی دەکەی ، لە خۆتی ڕادەکەی؟ | پارووی نان |
| ٣٠٠ | تا پیای نەکەی ناخەوێ؟ | دەرگا |
| ٣٠١ | ئالێکە سی و دوو بەردی تێدایە؟ | دەم و ددان |
| ٣٠٢ | تەیرەك هات بەهانە هان ، شاتەل سپی گەردەن مل بە کەوان ، گەورە گرتن کچە بەردان؟ | ڕەمەزان |
| ٣٠٣ | تەیرەك هات بەهانە هان، شا پەڕ سپی مل بەکەوان ، ئەگەر گرتت بردتنیمان ، ئەگەر نەتگرت نیتت نیمان.؟ | ڕەمەزان |
| ٣٠٤ | تا نەچیتە زەردە، لە کوونا بەردە؟ | ڕۆنی کەرە |
| ٣٠٥ | تەنافێکم هەیە؛ ئەگەر بیگرم گز دەبە. گەر بەریدەم گوناهبار دەبم؟ | ڕۆژوو |
| ٣٠٦ | تولی تەڕ ،تول بەندی تەڕ نالەی گەوهەر ، شماشالی کەڕ؟ | هەورو بروسکە |
| ٣٠٧ | تیکەی تەنگ دەخوا؟ | هێلکە |
| ٣٠٨ | ئالێی لەدەی ،دەنگی نایە؟ | دەهۆڵ |
| ٣٠٩ | تێکردنی سوونەتە ، لەقاندنی فەرزە؟ | ئەنگوستیلەیە |
| ٣١٠ | تەپ لەبلن تەپ،دەستت بەرەپ؟ | دەستاڕ |
| ٣١١ | تالێك ئاوەریشم ، بەغدای پێدەکێشم؟ | ڕێگـا |
| ٣١٢ | ترشە و مزرە وەك هەنار بالای بەرزە وەك چنار لە لادیٔ دەبیەنە شار؟. | ڕێواس |
| ٣١٣ | تا بیبە خشیت زیاد دەکات؟ | زانست |
| ٣١٤ | تا تۆ نەڕۆیت ئەو ناڕوات ؟ | سێبەر |
| ٣١٥ | تەپ گردیلەی گیا وردیلە؟ | سەرو پرچ |
| ٣١٦ | تا نەی دۆشی ناوەڕێٔ ؟ | گوانی ئاژەلٔ |
| ٣١٧ | تەنەکەی نەفتیٔ ، فورفەی کەتیٔ ، کەس نایگاتیٔ؟ | گوللە |
| ٣١٨ | ترشە وەك دۆیە ، خرە وەك گۆیە؟ | لیمویە |
| ٣١٩ | تیلاوی ئاشراو ، وەستانە دیووە، کەوای دوراو خەیات نەدیووە؟ | مارو کاژی مار |
| ٣٢٠ | ئاقە سواریٔ، دای لە دیواریٔ ، بوو بە هەزاریٔ؟ | هەنـار |
| ٣٢١ | تووی لە بەردی گاسنی لە شاخی زەوی لە گۆشتی؟ | کلی چـاو |
| ٣٢٢ | توولی تەڕ توول بەندی کەڕ ، لە نالەی شێر حەیلەرە کەڕ؟ | هەور |
| ٣٢٣ | تەیرێکەو بە حەواوە زنجیرەکەی پساوە ، تەیرەکــە پێی ڕشاوە؟ | بروسك |

## پیتـــی ( ج )

| | مەتـــــــــەڵ | وەڵام |
|---|---|---|
| ٢٢٤ | جامێ ماستێ ، لەسەر دەستێ، رەق رادەوەستێ؟ | مانگە |
| ٢٢٥ | جگەرە دەکێشێ و نەبەدەستێ دەگیرێ، نەبەزار؟ | لوولەی زۆپای داران |
| ٢٢٦ | جانت و جانتای زەرە ، پوزو دوولاین ؟ | دەرپێ |
| ٢٢٧ | جانت و جانتای زەرە ، تەری دوولاین، تەری دەکەی، پێدا دەکەی؟ | دەرزی و درومان |
| ٢٢٨ | جاجمە سەوزە ، لە گۆی حەوزە ، نە قەوزەیە ، نە پیرۆزە؟ | چیمەن، گیا |
| ٢٢٩ | جامی زێر لەناو جامی زیو؟ | هێلکە |
| ٢٣٠ | جامی تەنگ ، ناوی دوو رەنگ؟ | هێلکە |

## پیتـــی ( چ )

| | مەتـــــــــەڵ | وەڵام |
|---|---|---|
| ٢٣١ | چوومە باغی منەوەر، تێدابوو یەك جانەوەر، بەسینگ شێر و ئەسپ سەر؟ | کلۆ |
| ٢٣٢ | چەرمی خاوە لەناوناوە، قەد نەتواوە | مەشکە |
| ٢٣٣ | چوومە نواڵەکێ، هەموو زاوان بە جارەکێ؟ | رێواس |
| ٢٣٤ | چوار پێ لەعەردێ، دوولەتەنیشتێ، قنگ لەبن کلکێ، کێر لەسەر پشتێ؟ | پیاوێك سواری ئەسپ بوو |
| ٢٣٥ | چل تاق، چل نیوە تاق ، چل حۆری پاژنە پان؟ | هەنار |
| ٢٣٦ | چەوت و چێل و چەمییە، وشك و رەق و بێدییە؟ | گۆپاڵ |
| ٢٣٧ | چەقماقە، چەق و لەقە، هەرچی دەست داتێ نە حەمەقە؟ | دووپشك |
| ٢٣٨ | چوار پێ قوندەکە، لەبانان رادەکا؟ | بۆقە |
| ٢٣٩ | چشتێکی عاجباتیم دیت لەو دەشتە، رەوان ( رۆح ) چوارە، بەلەش پێنجە بەقاچ هەشتە؟ | ٤ پیاو تەرمی و مردووکیان هەلگرتووە |
| ٢٤٠ | چەرمم دەرهێنا، رەقی لەگەڵ هات وە دانا، دووجارپیاهات لەگەڵ دەرهێنان، ناوی لەگەڵ هات؟ | کلاان، پکووك، کل لەچاوکردن، فرمێسك |
| ٢٤١ | چوار پێی چەقە، دووی لەقە، دوو لێ رەقە، دوولێ زەقە قیمانەقێت، قیت دەبنەوە؟ | بزن |
| ٢٤٢ | چشتەك هەیە هەموو چشتەکی بەبن دادەروا؟ | قەڵەم |

| ٢٤٣ | چوومە سەرکانیەکی سەدوسی (١٣٠) سوار لەرەنگەکی؟ | ماسی |
|---|---|---|
| ٢٤٤ | چوومە هۆدەکی، سی و دووبەرد لەرەنگەکی؟ | دەم و ددان |
| ٢٤٥ | چەندی لێی بدەی گەورەتر دەبی ؟ | بیر لێدان |
| ٢٤٦ | چەند درێژ بێ، کورت دەبێ؟ | تەمەنە |
| ٢٤٧ | چاو زەرد لەچاوسپی دەترسێ؟ | ئاگرلەناو دەکرن |
| ٢٤٨ | چوومە سەر گردەکی، پێم کەوتە قۆرتەکی؟ | پێڵاو |
| ٢٤٩ | چوومە هەردێ، لەبن زردێ، دارێ بەچەپۆك، دەریدا بەردێ؟ | ئاشی ئاوە |
| ٢٥٠ | چوار براهەن لە تۆ دەڵێت یەکیان لەیەکی خۆشتر دەڵێت؟ | هەورە برۆسك |
| ٢٥١ | چوار دەچەقێن ، دووی دەلەقێن دووی دەربقێن ، دووی دەزەقێن؟ | بـزن |
| ٢٥٢ | چوار زیندوو ، یەك مردوو ؟ | تابووت |
| ٢٥٣ | چوومە کانیەك ئاونا دەستم شوشت چاونا؟ | نەوت |
| ٢٥٤ | چار دەچەقی ، سێی دەلەقی ، دووی دەلەقی ، دوو بەزەقی؟ | ئاژەڵ |
| ٢٥٥ | چارۆگەیەکی شینی چوار گۆشە ، پڕە لە کاری پرشە پرشە؟ | ئاسمان و ئەستێرە |
| ٢٥٦ | چاو ئاسکی دەنگ دلێر ، فیل گەردەنی جێگە شێر؟ | بۆق |
| ٢٥٧ | چاندم نۆك ، شین بوویی ، پەلك پانی بەهەرمێ؟ | پەمۆ |
| ٢٥٨ | چل ئاڵ ، چل بزمار ، چلچلۆکەی چل هەزار؟ | پشتە سەرە |
| ٢٥٩ | چوار مامم هەیە لە دەشتێ نۆ سەد دەرزی لە پشتێ؟ | ئاژەڵ لەکاتی شیر دۆشین |
| ٢٦٠ | چوار دەورەی ئاوە ئاوی تەندوورە ؟ | سەماوەر |
| ٢٦١ | چوار دەچەقێن ، دووی دەلەقێن ، دووی دەربقێن ، دووی دەزەقێن؟ | بـزن |
| ٢٦٢ | چوومە ناو نزارەکی بیپوورەدا لە دارەکی داران لەرزی بە جارەکی؟ | تەون |
| ٢٦٣ | چەوت وچێل و چەمییە، وشك و رەق وبێ دوییە؟ | تفەنگ |
| ٢٦٤ | چوومە سەربەردی روانیم لەزەردێ، دار لەچەپۆك، بەربوو لەبەردێ؟ | ئاش |
| ٢٦٥ | چوار باڵ وسەرێ ،دایم بەدەوە، جرو گەوهەرێ، مەکانی ئاوە؟ | ماسی |
| ٢٦٦ | چوومە هەردێ ، لەبن زەردێ،دارێ بەچەپۆك،دەیدا لەردێ؟ | ئاشی ئاو |
| ٢٦٧ | چەملوەی چەملوە، مردی زیندووی تێکراوە؟ | قەفەزی کەو |
| ٢٦٨ | چاڵی قەوی، دووکونە ریوی دووچرای گەشی. دوو ماری رەش؟ | دەم و چاوی مرۆڤ |
| ٢٦٩ | چوومە لێرەوارەکی ، بریم سەردارەکی ، کردمە قازێی شارەکی؟ | تەبەق |
| ٢٧٠ | چاری گۆیە ، هەشتی پێیە ، ئاومەندی دارە ، کلکی خوارە؟ | جۆت کردنە |

| ٢٧١ | چاری گۆیە ، هەشتی پێیە ، بووکی دەوەێ؟ | جۆت کردنە |
| --- | --- | --- |
| ٢٧٢ | چاری گۆیە ، هەشت شەقاوە ، دار لەناوە؟ | جۆت کردنە |
| ٢٧٣ | چوومە شاری شکاکان ، گۆشتم دیت ناو مراکان؟ | چاو |
| ٢٧٤ | چارە نابێ بە پێنج؟ | چوار مەزهەبەکە |
| ٢٧٥ | چوومە دەشتی زێری ، مێم دیت لەسەر نێری؟ | دەستار |
| ٢٧٦ | چیای نەرزکیە ، مووی بزنییە؟ | رەشماڵ |
| ٢٧٧ | چوار دەوری کولەکە ، ناوەراستی چەرخ و فەلەکە؟ | زمان و دەوە |
| ٢٧٨ | چوار پەڵ دەڕوات لە ڕێیە ، قالبی دڕك و زرێیە ، چاوی دەرێ تریێیە؟ | ژووژگ |
| ٢٧٩ | چوومە لێرەکی پەدار ، بەدار قەت دارەکی ، وانەبوو بیکەمە دەستار؟ | قۆچی ئاژەڵ |
| ٢٨٠ | چواری چاوە ، هەشتی هەنگاوە ، پشتی دارە ، پێشی پیاوە؟ | کەرو عارەبانە |
| ٢٨١ | چەرمم دەرێنا ، رەقی لەگەڵ هات ، لەناو مومم نا دووجاری پیا هات لەگەڵ دەرهێنان ناوی لەگەڵ هات؟ | کل لە چاوکردن |
| ٢٨٢ | چشتەك هەیە لە دەشتێ ، سی و سێ کندری لە پشتێ؟ | کورتان |
| ٢٨٣ | چل تاق چل نیم تاق ، پریەتی لە برنجی پاك؟ | کونجی |
| ٢٨٤ | چالێکم هەلکەند چل گەزێ ، فاتمەخانی تێیەزێ ، سەری پڕە لە دەرزێ؟ | کەنگر |
| ٢٨٥ | چواری چێرێ، هەشت دێرێ ، دوازدەی ڕمەچێرێ؟ | گوان |
| ٢٨٦ | چەرمە ، گەرمە ، نەرمە ، دۆخینی بکەوە تێبەربە؟ | گێپە |
| ٢٨٧ | چوار باڵ و دوو چاوە ، دووژمنی زەوی و هەتاوە؟ | ماسی |
| ٢٨٨ | چوومە شاری شکێنا ، گۆشتم دیت هێسك تێ نێنا؟ | مەمك |
| ٢٨٩ | چوومە سەرگردەکی ، فیتەم کردە شوانەکی ، سی و حەفت بەران لەنەوعەکی؟ | هەنگوین |
| ٢٩٠ | چاری چاوە ، هەشتی لاقە ، ناوی دارە ؟ | هەوجارە |
| ٢٩١ | چاری لە عەردێ یە ، دووانی لە قەدی یە ، کونەکی لەسەر پشتی یە ، کونەکی لە بن کلکی یە؟ | ولاخ و سوارە |

| | پیتـــی ( ح ) | |
|---|---|---|
| | مەتـــــەڵ | وەڵام |
| ٣٩٢ | حەمەی لاونیو، هەشت لاقی هەیە بێ موو، گۆشتی ناخورێ بەسەری توو؟ | قرژاڵ |
| ٣٩٣ | حەی لەسەر حەی، لەنەرزی حەی، بەنەمری خودای؟ | قامیش |
| ٣٩٤ | حەلوای تەنکەنانی ،هەتا نە یخوی نازانی؟ | شلکینەیە |
| ٣٩٥ | حوشتر حایە ، لە حەوایە ، دایم لە دەشتە ، کون لە پشتە؟ | رەشماڵ |
| ٣٩٦ | حەوت نانی سپی و قودویەکی جەعفەران، گەر بیزانی خوتی قارەمان؟ | گوڵە نێرگز |
| ٣٩٧ | حەواتیکە حەوا دەکات بەدەست و پێ سەما دەکات خواردنی پاشا پەیدا دەکات؟ | مێش هەنگوین |
| ٣٩٨ | حەفت بووك هی مارەکی ،هەرحەفت هی سارەکی؟ | گوڵە نێرگزە |
| ٣٩٩ | حاکمە حوکمی نییە ، دوو بەرخ دەخوا نیسقانی نییە؟ | مناڵی شیرە خۆرە |
| ٤٠٠ | حەوشە رەشەو چرتوفرت؟ | برێشکەی نلوساج |
| ٤٠١ | حاجی بە ڕۆژووە، پیاز نلو دەخواتەوە ، رۆژیشی ناشکێ؟ | پیلزەکە نلو دەخوا |

| | پیتـــی ( خ ) | |
|---|---|---|
| | مەتـــــەڵ | وەڵام |
| ٤٠٢ | خوریە پیرە مەرێ، دەلتێم لەبن بەرێ، لەبۆ رۆژی خێرو شەڕێ؟ | بەرماڵ |
| ٤٠٣ | خریلە حەفت کوون چیە؟ | سەری مرۆڤ |
| ٤٠٤ | خانیەکم هەیە چارپێ، هەزار ماڵ لەوێ ؟ | مێش هەنگوین |
| ٤٠٥ | خالغۆکەیە، دەستت بەساقی، جابێرە دیار گەمەو مەزاقی؟ | تەڤی |
| ٤٠٦ | خرمو رەقە،وەك کەلایە، چوار مندالی لەزکیدایە ؟ | گوێزە |
| ٤٠٧ | خوات لەگەڵ نەبی، میوانەکەش گوتی، ماڵت نلوانەبی بۆ وایانگوت؟ | ناویان ( نەبی )یە |
| ٤٠٨ | خارناوی دارە، گنیی وی خولییە؟ | سوێەی دارە |
| ٤٠٩ | خواردنم بلەی دەژیم، ناوم بدەی دەمرم، من کێم ؟ | ئاگرە |
| ٤١٠ | خەلکی داوای دەکەن نەگەرنیت لێ رادەکەن نەگەر بێت؟ | باران |
| ٤١١ | خواردنیکە دووجار دەکولێ، بەئاسانی پێت ناخورێ؟ | ساوارە |
| ٤١٢ | خەنەهەی خەنە، زەرد گوڵ خەنە؟ | گەنمە شامی |

| ژ | مەتەڵ | وەڵام |
|---|---|---|
| ٤١٣ | خەنە زەرد خەنە سەد سندوقە لەسەر یەك سندوق بەندە؟ | گەنمە شامی |
| ٤١٤ | خەڵكی كەیوانە ماڵی لە چۆمانە خواردنی لە ناوەدا نیانە؟ | ئاش |
| ٤١٥ | خانووی یەك كۆڵەكە؟ | كارك |
| ٤١٦ | خانوویەكم هەیە پڕە لە بەردی سپیلكە؟ | دەم و ددان |
| ٤١٧ | خۆی لە ماڵ كامزران دەكا، كورەكەی لە دەشت جلیتان دەكا؟ | ئاگرو دوكەڵ |
| ٤١٨ | خڕە وەك هەرمێ ، سپییە وەكو بێ؟ | پەمۆ |
| ٤١٩ | خێ سورە ، داس خوارە؟ | خێ سورو داسیش خوارە |
| ٤٢٠ | خواردنێكە هەتا خۆنی لە پاڵ كەی تامی ناگرێ؟ | هێلكەی كوڵاو |
| ٤٢١ | خانووی سپی بێ دەرگا؟ | هێلكە |
| ٤٢٢ | خوشكی خارتە پورت نییە؟ | دایكت |
| ٤٢٣ | خالێكم هەیە لە دەشتێ سی ودوو كونی لە پشتێ؟ | ڕەشكەیە |
| ٤٢٤ | خەنجەری لێدەی كون نابێ ، ئاوی پێداكەی تەڕ نابێ؟ | سێبەر |
| ٤٢٥ | خواردنی مێرە، مێ بۆی زەرووره ، چوار دەوری بەحرە، ئاوی تەنووره؟ | سەماوەر |
| ٤٢٦ | خالۆیەكم هاتووە لەنهۆلییەوە ،كێروكونی هابەكۆلییەوە؟ | چیغ چیت |
| ٤٢٧ | خەڕكەوە، خەڕیمن كەوە، بەستەبنچك، بنچكیشی كەوە؟ | شووتی |
| ٤٢٨ | خالۆیەكم هەیە یارۆ یارۆ، دەرفتنگ ڕەشی ناوچەوان مارۆ؟ | زەردەواڵە |
| ٤٢٩ | خانوویەكم هەیە بەبێ دەرك وبان ، پرێتی لە خانمی شان لەبان شان؟ | هەنار |
| ٤٣٠ | خڕە وەك گۆ، سپی وەك گۆ؟ | هێلكە |
| ٤٣١ | خالۆیەكم هەیە هونی هونی،دەست لەباخەل سەرلەقونی؟ | ژووژگ |
| ٤٣٢ | خڕ شین ، سەربەندی شین ، بەستراوەتەوە لە مێرگی شین؟ | شفتییە |
| ٤٣٣ | خڕە وەكی مازییە ، شینە وەكی كودییە ، سوورە وەكی شفتییە؟ | شەفەلە |
| ٤٣٤ | خانوویەكی تەنگ و تاریكە، پڕی لە عارەبی مل باریكە؟ | مێروستان |
| ٤٣٥ | خالێكم هەیە لە زوورگی ، سەری گەورەترە لە هورگی؟ | مێروستان |
| ٤٣٦ | خشت و مشت چوو، درا هەوانیشت؟ | گێسكە |
| ٤٣٧ | خالێكم هەیە لەبن گلی، بەسمێلان دەلێ ولی ولی؟ | مشك |
| ٤٣٨ | خواری لەتەوتەت نییە، بانی تەتەوتەت نیە ، خایەكەرو مامزنییە؟ | كیسەڵ |
| ٤٣٩ | خڕە وەك گۆ، نەرمە وەك پەمۆ؟ | تەشییە |
| ٤٤٠ | خول خولەباقی،دەستم وساقی ،سەیرو سیاوەزاقی؟ | تەشییە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٤١ | خریل خریله، لەبن بەردیله، ئەوەی هەلی ئەهینێ ناوی دەنێم گوجیله؟ | یاپراغ |
| ٤٤٢ | خالێکم هەیه لە زۆر گلی یە ، بە کونی خۆی دەلێ ولی ولی؟ | مشك |
| ٤٤٣ | خۆشه گووشه ، خۆشه مووشه؟ | هەنگوین – رۆژی شەممە |
| ٤٤٤ | خالێ من بێ تێت ل دەشتێ، حەلا نەکێ ل پشتێ؟ | کیسەلە |
| ٤٤٥ | خالێ منێ ئەسکەنلەر، حەفت کراسی لەبەر؟ | پیازە |
| ٤٤٦ | خالێ منێ ب لنگەکێ، دەچیتە شەرێ گوندێ؟ | تەور |
| ٤٤٧ | خەلتی بێ خۆر ، میی بێ بەر ، گوندی بێ سەر؟ | هێستر، گۆرستان |

| | | |
|---|---|---|
| | پیتی ( د ) | |
| | مەتەڵ | وەڵام |
| ٤٤٨ | دەگرمێنێ هەور نییه، دار دەبڕێ مشار نییه، سوری دەکات بۆیاغ نییه، دوکەڵ دەکا ئاگر نییه؟ | مێ ( ئەلفلم ) |
| ٤٤٩ | دەفڕێ، باڕی نییه، دەتەنێ ژن نییه، سجن دەکا حوکمەت نییه؟ | جاڵجاڵۆکه |
| ٤٥٠ | دوو لەرنیه، یەك لارنیه | شەوو رۆژو شەیتان |
| ٤٥١ | دوو لەدووی، هەشتان دەچن..؟ | جوتیارو دوو ولاغ |
| ٤٥٢ | دەنگی دووره، شلقەی ژووره، بازنەی سووره؟ | مەشکه |
| ٤٥٣ | دەروا هەر لەجێگەی خۆیتی، قایشی زۆری لەپشتی، شەو رۆژ رێی دەکا، وەستاوەلەشوێن خۆیدا؟ | ئاش |
| ٤٥٤ | دەلەزگ، دووانن؟ | پەنجەو گوانی ئاژەڵ |
| ٤٥٥ | دەست بەقنگی، دەستت بەکێری ، خۆش خۆش هەڵدەستێت ئاگری بۆ دێنێ ؟ | قەنەنه |
| ٤٥٦ | دەچوەمەنۆکاران، دەکوتا بەداران، گرمەی دەهات وەك هاران؟ | دەهۆڵ |
| ٤٥٧ | دوور هات دوورهات، قەلەمو کاغەزی سوور هات؟ | بروسك |
| ٤٥٨ | داری حەفت بەر ، خۆشەی کوندەی، تیماری زمانی؟ | دار مازی |
| ٤٥٩ | دارم لەداری، چەرمم لەداری، ملە دابڕاو تۆبنیه دیاری.؟ | مەشکەیه |
| ٤٦٠ | دەوی هەیه ناقری، بێ پێو بێ باڵە دەفڕێ، گۆشتی دەخورێ سەربنابڕێ..؟ | ملسییه |
| ٤٦١ | دندووکی قەلەم، سەرکی مارە، ژێرسکی بەرخە پشتی کارە..! | پەرەسێلکەیه |
| ٤٦٢ | دەیکوژنەوه قەسباب نیه،گۆشتی دەخوا گورگ نیه؟ | بازو هەڵۆ |

| ژ | مەتەڵ | وەڵام |
|---|---|---|
| ٤٦٣ | دارێکم هەیە بێ گوڵە، میوەی هەتا بڵێ شیرین و بەدڵە؟ | هەنجیرە |
| ٤٦٤ | دەبارمدار هەڵدەگرێ، بزمارێك هەڵناگرێ..؟ | ئاوە |
| ٤٦٥ | داپیرەکی رەق و هیشکە، تەونی دەکا بەبێ پیشکە؟ | داپیرۆچکەیە |
| ٤٦٦ | دارە لەسەر دارێ، ئاو ریشمی مرواری، ئاسن بۆتە ئاساری؟ | تەشییە |
| ٤٦٧ | دوازە گونئۆرەی ساڵ یەك حەرامەو یانزە حەلال؟ | ساڵ و مانگی رەمەزان |
| ٤٦٨ | دەڕوا پێی نییە، دەبینێ گوێ نیە، تەڕە تووڵ نیە؟ | مارە |
| ٤٦٩ | دێوە رەشەی ئاسمانە، گورزی هەژدە باتمانە، چاوی پڕ لەگریانە؟ | هەورو بروسكە و بارانە |
| ٤٧٠ | داری چەماوە، بە پیستە خۆش کراوە گیانداریکی لەناوە؟ | قەڵەرز و کەوە |
| ٤٧١ | دووشتن پێکەوە دەنوون، پێکەوە هەڵدەستن، پێکەوە دەگرین، پێکەوە پێدەکەنن، یەکتریش نابینن؟ | چاوە |
| ٤٧٢ | دووباز لەقەد چیان، بەرامبەریەکن، بیانگرن دەمرن، بەریان دەی دەفڕن؟ | چاوە |
| ٤٧٣ | دوو لەخۆرە سێی لەمیینەرە، تۆ ئازابە ناوی بەرە؟ | نوێژەکانە |
| ٤٧٤ | داری چل ئاواز چیە؟ | رادیۆیە |
| ٤٧٥ | دایم سەرم دێشێ، بابم پشتی دێشی، منداڵەکان هەموو لەشی دێشی؟ | ساپیتەی خانوو. |
| ٤٧٦ | دارەکم هەیە لە موکرێ، بەری دێنێ وەك شەکرێ، هەرچی بێ خوات پێ دەمرێ؟ | توتن |
| ٤٧٧ | دەڕوا پێی نییە، دەخورێ گۆشتی نییە؟ | ئاو |
| ٤٧٨ | دووژمنە لێناگرێ، بەتەن داری هەر دەگرێ، بەردەکیشی راناگرێ؟ | ئاو |
| ٤٧٩ | دەنگی هەیە ورەنگی نییە، شت فڕێدەداو دەستی نییە؟ | باوئاوە |
| ٤٨٠ | دەڕوا لەڕێ ڕێ، نەدەچینرێ، نەدەڕوێ؟ | هێمترە |
| ٤٨١ | دەنگی هەیە رەنگی نییە، بە مقاش بیگری گۆشتی نییە؟ | با |
| ٤٨٢ | دەچمە نێو نزارەکی دادەنیشم لە بن دارەکی؟ | ئەولادی بەرحمەت |
| ٤٨٣ | دەمی شاخە، شاخی چەمە، دەنگی زلە، نوکی نەرم؟ | کەڵەشێر |
| ٤٨٤ | دووە ئابێ بەسێ؟ | شەو و رۆژ |
| ٤٨٥ | درێژەو پێی دەڵێن خڕ؟ | دۆڵ |
| ٤٨٦ | دوانزە پاشاو سێ پاسەوان؟ | کاتژمێر |
| ٤٨٧ | داری بێگوڵ، ئەسحابەی بێدڵ، خورادنی بێتوێکل؟ | هەنجیر، ماسی، خوێ |
| ٤٨٨ | دەنوکی قەلە، سەلکی مارە، ژێر سکی بەرخە، بان پشتی کارە؟ | حاجی لەق لەق |
| ٤٨٩ | دەستەسرێکم هەیە چوار گۆشە پڕی لە کارێلەی دەپۆشە، پۆشە؟ | ئەستێرە |

| ژ | مەتەڵ | وەڵام |
|---|---|---|
| ٤٩٠ | دە لاق و شەش چاو نێو قەد دار و پشت پیاو؟ | جۆت کردن |
| ٤٩١ | دوو ژوور ژوور گۆشت لە ژوورەوە نیسقان لە دەرەوە ؟ | گوڵە شیلان |
| ٤٩٢ | دار لەسەر داری ، ئاوریشمی مرواری ، ئاسن بۆتە ئاساری ؟ | تەشی |
| ٤٩٣ | دەخورێ گۆشتی نییە ، دەشیکوژێیەوە خوێنی نییە؟ | گەڵای دار |
| ٤٩٤ | دووگام هەن هەموو گردان دەکێلن؟ | چـاو |
| ٤٩٥ | دارەبەن سەوزە کەرە بەسەریەوە؟ | دارەبەن خۆی سەوزە، بنیشت دەگری سپییە وەکو کەرە |
| ٤٩٦ | دێنم لە ئەرواوی بلر دەکەم لە ئەزاوی دەرۆم لە ئەبراوی؟ | خوێ . نێستر. ڕیگەو بان |
| ٤٩٧ | دایم سەر سوار و کەرە هۆی حەسانەوە سەرە هەم سەرهەم ژێر دەکەوێ گەر ئەو نەبێ کورد بێ وەیە؟ | سەرین - بالیف . |
| ٤٩٨ | دەرخونە قونێ تامی چێشتێ؟ | دوونگی مەڕ |
| ٤٩٩ | دەڕوا لاقی نی‌یە دەگرێ چاوی نی‌یە هاوار دەکات زاری نییە؟ | هەور |
| ٥٠٠ | دەخورێ گۆشتی نییە دەشیکوژێیەوە؟ | دوونگی مەڕ |
| ٥٠١ | دەیبرێ ئاشی بینی؟ | بـا |
| ٥٠٢ | دار سولکی خاران ، کەوتە پشت ماران؟ | بارگینی |
| ٥٠٣ | دەفڕێ باڵی نییە ، سەری دەبڕی خوێنی نی‌یە؟ | پەلکە گەڵا |
| ٥٠٤ | دەفڕێ باری نی‌یە ، دەنیشێ کلکی نی‌یە ، سپی‌یە و شەکر نییە؟ | بەفر |
| ٥٠٥ | دوو بەزەقی ، دوو بەڕەقی ، چوار دەچەقی ، دوو دەلەقی؟ | بزن |
| ٥٠٦ | دەنگی هەیە، مرۆڤ نی‌یە، لە ئاوو لە سەر زەوی یە . گۆشتی وەك گۆشتی مەرییە؟ | بۆق |
| ٥٠٧ | دەنکە ئاری ئامە چاری ، بوو بە هەزاری؟ | پشکۆی ئاگر |
| ٥٠٨ | دەیبەستیەوە دەڕوا ، نایبەستیەوە ناڕوا ؟ | پێڵاو |
| ٥٠٩ | دوو بەندو بەنکە ، دوو دەف و دارەکە؟ | تەرازوو |
| ٥١٠ | دارەکە لە دارەکە ، ئاسنەکە لە دارەکە ، پەتەکە هەوسارەکە؟ | تەشی |
| ٥١١ | دار لە داری سوارە بی ، ئارەقەی لێ بزماربی ، پەتکی لێ هەوسارەبی؟ | تەشی |
| ٥١٢ | دار لە داری پیرە لۆکە و هەوساری؟ | تەشی |
| ٥١٣ | دەستت لەناو ورگیتی ، ورگت بە ورگی‌یەوە نایە؟ | تەنوور |
| ٥١٤ | دوو بران ، لە قەد چیان ، بەرانبەر یەك نابینان بیانگرین دەمرن، بەریان دەی دەفڕن؟ | چاو |
| ٥١٥ | دەورە دەورەکەی دارە ، ناوەندەکەی پڕ قورە ، کە رەفام کە خشت برە؟ | خشت بڕ |
| ٥١٦ | دارەك لەسەری ڕێدا، مۆر مەرجان دەبەردا ، هەرچی گەیێنێ وەدەست لێدا؟ | داری بەلاڵوك |

| ژمارە | مەتەڵ | وەڵام |
|---|---|---|
| ٥١٧ | داپیرێکم هەیە لە دەشتێ ، کەچە شیرمکەی لە پشتێ؟ | دووپشك |
| ٥١٨ | دەرواتْ پێی لی‌یە ،جێی پێشی دیارە؟ | دەرزی دوورمان |
| ٥١٩ | دەشتێکەو دوکانێکە ، چوار مەڕو شوانێکە؟ | دست و پەنجەکان |
| ٥٢٠ | دوویان ، دوو دوکان ، هەشت مەڕو دوو بەران! | دست و پەنجەکان |
| ٥٢١ | دایك مردی باب مردی ، فەرخولان سەر پێ کردی؟ | دەستەلك |
| ٥٢٢ | دارێکی قەوی ، دوو کونی ڕێوی ، دوو چرای گەش ، دووماری ڕەش ؟ | دەم و چـاو |
| ٥٢٣ | دووماری ڕەش، دوو ئەستێرەی گەش ، لێرەی پڕموو، دوو کونە سوورێ، بەچەی بێ بێ؟ | دەم و چـاو |
| ٥٢٤ | دوو شت هەیە ، دەڕواو سێبەری نییە؟ | دەنگ و ناوبانگی مرۆڤ |
| ٥٢٥ | داك ئاو ، باب خۆر ، کور وەك خەبەتۆر؟ | دووکەڵی بەران |
| ٥٢٦ | دەستاریٚ لە لێژی؟ | دوکەڵی مەڕ |
| ٥٢٧ | دای دەنێم بێژینگە . هەڵی دەگرم قورینگە؟ | ڕەشماڵ |
| ٥٢٨ | دەکرێ ڕەشە ، بەکاری دێنی سوورە، دەڕێژی بۆرە؟ | ڕەژوو |
| ٥٢٩ | دەچێتە سەری چیاو ناروا! | ڕێگا |
| ٥٣٠ | دەڕواو ڕا ناوەستێ ، قاچی نیە؟ | کاتژمێر |
| ٥٣١ | دەڕۆم لە ئەبڕووی ، دەچینم لە ئەچناوی ، لێ دەخورم لە ئەزاوی؟ | ڕێگا ،خوێیە، هێستر |
| ٥٣٢ | دارێکم هەیە دوانزە لکە ، هەر لکەکی سی پەلکە؟ | ساڵ و مانگ و رۆژەکان |
| ٥٣٣ | دارێکم هەیە دوانزە لکە ، هەر لکەی سی پەلکە دوو هێلانەو یەك هێلکە؟ | ساڵ و مانگ رۆژ جەژنی رەمەزان |
| ٥٣٤ | دیزەی ڕۆنە، دەرخۆنەی قوونە ، ئەگەر نایخۆی بۆمنی بینە؟ | دووکەڵی مەڕ |
| ٥٣٥ | دەشتی ئاوە ئاوی تەنووورە ؟ | سەماوەر |
| ٥٣٦ | داسولکی خاران ، کەوتە پشتی ماران؟ | سینگی ڕەشماڵ |
| ٥٣٧ | دووە نابێ بە سێ؟ | شەوو رۆژ |
| ٥٣٨ | دەوی نی‌یە ، ددانی هەیـە؟ | شانـە |
| ٥٣٩ | ددە ناکەم ، بەبەو ناکەم هۆردوو قاچی لە هەواکەم ، جیرو هۆڕی لێ پەیداکەم؟ | شەغرە |
| ٥٤٠ | دارەکم هەیە داری ماوێ ، مردی‌یەو زیندی لەناوی؟ | قەفەزە کەوی |
| ٥٤١ | دومبەران بە دومبەران ، لاشی لەسەر دوو قوتەران ، بەدەوری پیرو پێغەمبەران؟ | قەبر – گۆڕ |
| ٥٤٢ | دەفری باری نی‌یە ، سەری دەبڕی خوێنی نییە؟ | قەڵەمە لاشك |
| ٥٤٣ | دەخوا بێ قونە دەڕوا بێ شونە؟ | قرنە |

| ٥٤٤ | دارێکم هەیە بەر دەگرێ، ئەوەی بیخوا پێی دەمرێ؟ | قورئان |
|---|---|---|
| ٥٤٥ | دەستووری هەردوو ژیانە ، دادوەری یەکسانە ستایش و فەرمانە، خاوەنی خوای گەورەو میهرەبانە؟ | قورئانی پیرۆز |
| ٥٤٦ | دەیبینی لەبەرت نییە ، لەبەرتە نایبینی؟ | کفن |
| ٥٤٧ | دەڕوا و رادەوەستێ . کەچی پێشی نییە؟ | کاتژمێر |
| ٥٤٨ | داك مردی باب مردێ . فەرخۆکەی سەر پێ کردێ ؟ | کاریتەو شەقرە |
| ٥٤٩ | دەوێ هەیە ، خواردنی پێ ناخورێت؟ | منداڵ لەناو سکی دایکی |
| ٥٥٠ | دەچێتە جێیەکی بەموو ، دێتە دەرێ ناو لە دوو؟ | کل و چووك |
| ٥٥١ | دەرێی گۆشتە ، ناوی مووە ، دەخورێ؟ | کەپوو |
| ٥٥٢ | دانیشتوانی شارەك هەنە نەدەمرن ، نەباراش دەهارن؟ | گۆڕستان |
| ٥٥٣ | دوانت لێیەلکێشم دوانت لێڕاکێشم، بەوشکی تێت خەم ، بەتەڕی لێت راکێشم؟ | لغاوی ولاغە |
| ٥٥٤ | دوو هۆدە و کول کەیێ لە بەینا ؟ | لووت - کەپوو |
| ٥٥٥ | دارێکم هەیە لە نێو داران ، سەری دەبڕن بە مشاران، هێرە هێرێ وەك کاران؟ | زورنا |
| ٥٥٦ | دێتە خوارێ مەلیکە، دادەنشێ وەزیرە ، کاتێ دەڕوا فەقیرە ؟ | بەفر |
| ٥٥٧ | دارێکم هەیە لە نێو داران، دەیبڕنەوە بە مشاران ناڵەی دێ وەك بزن و کاران؟ | مێش هەنگوین |
| ٥٥٨ | دەستێ دەدەیە قونی ، دەوێ لێك دەکاتەوە؟ | مقەس |
| ٥٥٩ | دەستێ لەچاوێ رابکەی ،دەوێ دەکاتەوە؟ | مقەسە |
| ٥٦٠ | دەنگڵێ حەو دەنگڵێ زەوێ، شەش کەلە پاو دوولچی قەوێ؟ | تەرازوو |
| ٥٦١ | دە هۆرە، بەکۆڵەکەکی راوەستاوە؟ | کەپووە |
| ٥٦٢ | دوو پە نجەنە (قامك) لەناو ناگری رادەکەم هیچی لێ نایێ؟ | مقاشە |
| ٥٦٣ | دایکا دیکانە، بۆ مرۆڤ ناڤ نیشانە؟ | نیشتمان |
| ٥٦٤ | دوو لە دەست ، سەر لە قوون ، قوون لە زەوێ؟ | مەر دۆشین |
| ٥٦٥ | دەفڕێ باڵی نییە ، دەگرێ چاوێ نییە ، دەناڕێ زمانی نییە؟ | هەورە. |
| ٥٦٦ | درێژە وەکی مارێ، جووت جووت دێتە خوارێ؟ | تەزبیح |
| ٥٦٧ | دارا لەناڤ دارێ ، لێ تێ دەنگێ برینداری؟ | مێش هەنگوینە |
| ٥٦٨ | دارەکە دوانزە تالێدەچن، نەو ژێ دێنە سپەتا ، نەو سیە تاژێ بنەچار؟ | ساڵەو مانگی رەمەزانە |
| ٥٦٩ | داسکا مەلا نەحیای، چوو سەرێ چیایی، نەهێلاداڤاگیای؟ | مووس |

| | بیتی ( ڕ ) | |
|---|---|---|
| | مەتـــــەڵ | وەڵام |
| ٥٧٠ | ڕەقە وەك بەردی تارە وەك ژەهری، دەخوری وەك شەكری | گوێز |
| ٥٧١ | ڕەشە خەڵوز نییە، سپییە بەفر نییە، لەبەحردایە ماسی نییە؟ | چاو |
| ٥٧٢ | ڕیزە بەرێزە دار چەماوە، گەلا پشتی چەرمی خاوە، مردووە زیندووی لەناوە؟ | قەڵەمزو كمو |
| ٥٧٣ | ڕەشی مشمشت، لەكۆنی دەخشێ؟ | دۆشاوی ناوهێزە |
| ٥٧٤ | ڕاست وچەپی دەچیەكنی،ڕێگاو بانان هەڵدەچنی، دەچیە ماڵان دایلەكنی؟ | پێلاوە |
| ٥٧٥ | ڕاوەستام لەسەر گردەكی ، بانگم كردە یەكەكی ، هەزار هات بە جارەكی؟ | شوان مەڕەكانی. |
| ٥٧٦ | ڕەشە وەك بزن هوردە وەكو هەرزن ، بە پێنج لوی دەچن ، بەدوان دەیگەزن. | ئەسپێ |
| ٥٧٧ | ڕەقەبەرەقەی دەكەوێ ، سۆرە بەنەرمەی دەكەوی. | ئەستێ و بەردو قامە |
| ٥٧٨ | ڕەپی سـەر خـر . | تەزۆك |
| ٥٧٩ | ڕەش و سپی یەو خارخارە ، مۆركی كوردانە و كورد بەوە دیارە. | جەمەدانی |
| ٥٨٠ | ڕەشە وەك قیری سپییە وەك شیری لە ڕێ دەڕوا وەك وەزیری | حاجی لەق لەق |
| ٥٨١ | ڕەشە كوڕی ڕووناكییە ، بە بەرزیش نەبی ڕازی نییە . | دووكەڵ |
| ٥٨٢ | ڕۆڵەی شیرین و شەریلە ، دایكی چوورچەو چەویلە ؟ | دارمێو |
| ٥٨٣ | ڕەشە گرێ گرێ ، ئەگەر نەتزانی سەرت خورێ. | ڕەشكـە |
| ٥٨٤ | ڕەشە وەك دێوی . خواردن لە كێوی . | سۆبەی دار |
| ٥٨٥ | ڕەشە گەرمە تەڕبو تاڵە لەگەڵ ئەو بەفرە یەك ساڵە هەموو جیهانی بۆی بێزارە. | چـای |
| ٥٨٦ | ڕەشی ڕەشالوو، دەتنێن | سۆپای دارە |
| ٥٨٧ | ڕایەڵی سپیلكە تێومدانی سوركە دەیبڕیەوە شینكە . | قەزوان |
| ٥٨٨ | ڕەشەو شەو نییە سپییەو ڕۆژ نییە . | چـاو |
| ٥٨٩ | ڕەشەی بێ موو سواری دایكت بوو | عەبـا |
| ٥٩٠ | ڕەشە بزن نییە ، كفتەی دەكا ژن نییە . | قالۆچە |
| ٥٩١ | ڕایەڵی لە سپیلكی ، تێومردانی لە سوركی ، بڕانەوەی لە شینكی. | قەزوان |
| ٥٩٢ | ڕووی گەشە . هەناوی بۆشە. | قامیش |
| ٥٩٣ | ڕەشە وەك مەیمون . لووسە وەك سابوون. | قالوچە |
| ٥٩٤ | ڕەشە لە بنەبانێ هەر دێتە كابانێ . | كونلە |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٩٥ | ڕەپ ڕەپ وەستاوە، پەڕۆی تیا گیرماوە؟ | کەندوو |
| ٥٩٦ | ڕەشی بەرموو ، سواری دایکت بوو. | کوندە |
| ٥٩٧ | ڕاستە هیچ گومانی تێدا نییە ، مشت و مڕی لەسەر نییە. | مردن |
| ٥٩٨ | ڕکت لێتیی ، حەزیش ناکەی بیبینی ، هەردەم لێشی دەچییە پێش. | مردن |
| ٥٩٩ | ڕەشە ڕشە موش ، لەکەلاکتا دەخشێ. | مێروو |
| ٦٠٠ | ڕەشە کار نییە ، جۆ دەخوا ئاژەڵ نییە ، دیوار کوون دەکا دز نییە. | مێروستان |
| ٦٠١ | ڕەشکەی دووگون، دەپەڕی لەڕێ؟ | کوندەیە |
| ٦٠٢ | ڕەشەهەمبانێ، هەلدیتەکابانێ؟ | مەشکەیە |
| ٦٠٣ | ڕەگی لەبن هەردێ، دان لەسەرهەردێ، ئەگەر بزانی مەردێ؟ | گوڵەگەنم |
| ٦٠٤ | ڕکت لەهەقی دەبیتەوە، لەبەر ڕەحمەتی خواش هەڵدێیی؟ | مردن، بارانە |
| ٦٠٥ | ڕەپ ڕەپ وەستاوە، پەڕۆی تێگیراوە؟ | کەندوو |
| ٦٠٦ | ڕەشەی ڕەش بەڕاز، دندووک ئالقەڕاز، چل گەزی کراس؟ | چادر |
| ٦٠٧ | ڕەشە غەڵ نییە، جەی دەخوات کەرنییە، دناڵ مالێ نێت ودچیت مشک نییە، دفریت بالندە نییە؟ | مێرووله |
| ٦٠٨ | ڕەشی لەساری ، هەر دادەداتە کابانی . | هێزەی ڕۆن |

| | | |
|---|---|---|
| | پیتـــی ( ز - ژ ) | |
| | مەتــــــــەڵ | وەڵام |
| ٦٠٩ | زەردە وەك هێلکەی ڕوونی، کوڕە وەك داسی دوورنەیی؟ | مانگ |
| ٦١٠ | زریزەی بەزەنگیان، تەڕە لەمێرگو کوێستان، هەمیشە لەدوو ئاوان؟ | بۆق |
| ٦١١ | زەردە ڕۆژ نییە، بار هەردەگری کەر نییە، دەفڕی فڕۆکە نییە؟ | مێش هەنگوین |
| ٦١٢ | زەوی گۆشتە، تۆی نیە، شین دەبی، پەلکی نیە؟ | کوتانی لەش |
| ٦١٣ | زمانی نییە، گۆشتی دەخوری؟ | ماسی |
| ٦١٤ | زیندوو مردووەك ڕادەکێشێ، زیندووبێدەنگن، مردوو دەدوێتن؟ | قەڵەمە |
| ٦١٥ | زیندەوری بێ دایك و باوکن، لەبانەوە بانگدەکەن، خەڵیکینە خوا پەی مەکەن؟ | فریشەکانی ئاسمان |
| ٦١٦ | زەمین لاڤاوە، شارێکە لەسەرئاوە، هەموو زیندووەرێکی لەئاوە؟ | کەشتیەکەی حەزرەتی نوح ) |
| ٦١٧ | زگی پڕە، بێ سێبەرە؟ | چاڵی گەنم |

| | | |
|---|---|---|
| ٦١٨ | زىردى چوار پێیە، کانیەکی لێیە، ئاورگی پێیە؟ | سەماوەر |
| ٦١٩ | زاری لە پشتێ بۆ خۆی لە بەردێ ، هێزی لە ناوەدانێ | ئاشی ئاو |
| ٦٢٠ | زمانی لە پشتێ ، کلکی لە تەنیشتی ، رزقی لە دەشتی. | ئاشی ئاو |
| ٦٢١ | زەردی زەردێ ، لە بن بەردی ئەڵقەی شێرو گۆی نامەردێ. | مار |
| ٦٢٢ | زەردی زەعفەران، نام لە ووشتران ، ناردم لۆناو کافران. | تووتن |
| ٦٢٣ | زستانێ خرە، هاوینێ پڕە؟ | رەشماڵ |
| ٦٢٤ | زەردی زەردان ، لەبن بەردان ، وەکی مەردان. | دووپشك |
| ٦٢٥ | زیندوویەك هات مردوویەکی ئاشت مردوویەکیش لە جێگای خۆی زیندویەکی ئاشت | فاڵ |
| ٦٢٦ | زیندو و مردوو ئەکا ، مردوو زیندوو ئەکا . | مریشك هێلکە |
| ٦٢٧ | زەردە دەردە ، لەبن بەردە. | دووپشك |
| ٦٢٨ | زەنگەنە بۆم هەڵکەنە. | دلۆپە |
| ٦٢٩ | زەردە حاجی نىیە ، سەوزە سەید نىیە ، سپیىە مەلا نىیە. | گولی نێرگز |
| ٦٣٠ | زەردی زەعفەران نىیە ، نووسەراوە قورئان نىیە. | لیرەی ئاڵتون |
| ٦٣١ | زەردە زەرنیق نىیە ، سپیىە پەنیر نىیە ، بۆشە بۆق نىیە. | لیرەی ئاڵتون |
| ٦٣٢ | زەردە وەك زەعفەران، سپی وەك بەفری کەلان؟ | گولە نێرگز |
| ٦٣٣ | زۆر ڕەقە ، دەبێ بەئاو. | سەهۆڵ |
| ٦٣٤ | زەردی زەردی لە بن بەردی زاراوی بردی . | مـار |
| ٦٣٥ | زەردی زەردی ، لەبن بەردی ، حوکمی رۆژی زراوی بردی | دووپشك |

| | پیتـی (ژ) | |
|---|---|---|
| . | مەتـــەڵ | وەڵام |
| ٦٣٦ | ژوورێکی پاك و سپی ، خانمی جوانی تیادەژی؟ | دەم ودان |
| ٦٣٧ | ژوورێکمان هەیە، تاریك تاریك، پڕە لەزەنگە قلیشەی باریك؟ | دەوددان |
| ٦٣٨ | ژێری سپییە، پشتی رەشە، سەد کلاوی لەسەرکە، دەیسوتێنی، بەچەند چرکە | ساجی نان |
| ٦٣٩ | ژێری ئاگرە سەری ئاوە. | سەماوەر |
| ٦٤٠ | ژێری ئاگرە ، سەری ئاوە ، سکی خەزێنەیە. | سەماوەر |
| ٦٤١ | ژبۆ ستێ پێترە - ژگەزێ کێمترە. | قشقەلانك |

| | | |
|---|---|---|
| ٦٤٢ | ژەنیقە دار، ژویقەدار، بێت ناڤڵدا سەیێ هار؟ | خەنجەر |
| ٦٤٣ | ژن نییە کولێرەکەرە مار نییە سەر بەکۆنە هەوریش نییە دەگەرمێنێ | (هەنگ) |
| ٦٤٤ | ژنی سک پڕ سێبەری نییە! | مانگ |

| | پیتی ( س ) | |
|---|---|---|
| | مەتەڵ | وەڵام |
| ٦٤٥ | سێ سفر لەسەر رایە، جیرانی ئەلف و بایە، بێ نوون مانایی نایە؟ | ژیان |
| ٦٤٦ | سندوقی سەمەنی، تەقەمەکە دەیشکێنی؟ | قەزوانە |
| ٦٤٧ | سەری تاش و بنی تاش، مام نۆمەری کلک جاش. | ملاك، کەوچەك |
| ٦٤٨ | سەرتانە لووس، بن تانەلووس، قوڕی کەنی، قوڕمەنگەنوس؟ | کیسەڵ |
| ٦٤٩ | سێ تاس، سێ بنەتاس، سێ بەربووك و سێ ڕەقاس | کاتژمێر |
| ٦٥٠ | سەری پیسە، قوونی پاکە؟ | گێسك |
| ٦٥١ | سپی و لووس وزل وتاتە، راخەری کوردی و جێ تاتە! | حەسیری زل |
| ٦٥٢ | سێ گا، نۆگا خواردن؟ | وەرزی زستان، بەرهەمی وەرزەکانی تر دەخوا |
| ٦٥٣ | سەر ماشەڕۆ، پێ خاپەڕۆ؟ | کەلەباب |
| ٦٥٤ | سۆفی سەحەری، مامی دووردێن، ئەو لادی قوولێ؟ | کەلەباب |
| ٦٥٥ | سەری بەڕدێن، ڕدێنی بێ موو، چەرمە چەکاڵتە، هەیهوهەیهو؟ | کەلەباب |
| ٦٥٦ | سەری سوورە، ئەفەسی بەرەو ژوورە؟ | جگەرەیە |
| ٦٥٧ | سەری تیژە، بنی کوونە گێژە بزانە، سووژنە! | شووژنە |
| ٦٥٨ | سواری کەپووە، دووگۆیە، چاوی لەتۆیە | چاویلکەیە |
| ٦٥٩ | سواری هەراش، مەگی نیو بەرداش..؟ | زمانە |
| ٦٦٠ | سینگ داکوتراو، کوتەك نەدیتوو؟ | کەنگرە |
| ٦٦١ | سەگی هار، پڕیەبانندار، پەڕ و پۆی هێنایە خوار! | تەورداس |
| ٦٦٢ | سەیری خەڵکی دەکات، درۆلەگەڵ کەس ناکات..؟ | ئاوێنەیە |
| ٦٦٣ | سەری شاخە، بەری بڕیە، پیستەی بزنە تووکی نییە؟ | خەنجەرە |
| ٦٦٤ | سەردەمێك بەچوار دەڕوات، ماوەیەك بەدوان، لە پاشان بەسێیان؟ | تەمەنی مرۆڤ بەمناڵی و گەنجی و پیری |

| | | |
|---|---|---|
| ٦٦٥ | سی سوار هاتە شارێکی، هەرسی چوونە هەموومارەکی | مانگی رەمەزان |
| ٦٦٦ | سی تلق، سی بەرتلق ، سی دەرگەیە، سی حوجرەیە؟ | سی جزمەی قورئانە |
| ٦٦٧ | سەرێکی راستەو سەرێکی خوارە، خۆی ئاسنە سەرەکەی دارە؟ | مشارە |
| ٦٦٨ | سەری هەبێ چاوی نییە، چاوی هەبێ سەری نییە؟ | دەرزی، دەمبوس |
| ٦٦٩ | سەری زلە و سەلامەت بنی قوڵەو قیامەت بە ئەری ئیدەڵێ بە ووشکی دەیهێنیە دەرێ. | تەندووری ئاگکردن |
| ٦٧٠ | سوور دەکرێتەوە ، کەچی ناخورێ | ئاسن |
| ٦٧١ | سەری سەوزە ، لەشی رەشە ، ئاوی سپییەو دڵی گەش؟ | بایلنجان |
| ٦٧٢ | سەری لە زەوییدایە ، قاچی لە ئاسماندایە ، دەخورێ بەو خوایە؟ | پیلز |
| ٦٧٣ | سەد قوتی ناویەك قوتی؟ | پیاز |
| ٦٧٤ | سەری سپی‌یە ئاوی شیرینە؟ | پیرمژلی ئاوشیرین |
| ٦٧٥ | سەری مارە، زگی بەرخە، پشتی کارە کلکی مقەسە؟ | پەرەسێلکە |
| ٦٧٦ | سمێل قیتی لۆتیانە؟ | پشیلە |
| ٦٧٧ | سەری سپی‌یە و مووی نی‌یە هەڵنەپەرێ و پێی نی‌یە؟ | تەزرە |
| ٦٧٨ | سەری یەکەو بنی دوو بەکنگی بابوو با پیدا چوو؟ | رانك و شەرواڵ |
| ٦٧٩ | سپی‌یە و زلە ، قورمزی ، کونی نی‌یە ، ناو دەدزێ؟ | شووتی |
| ٦٨٠ | سەری پی‌یە و پێی سەرە بە پێنج پیت ناوی بەرە؟ | قرژاڵ |
| ٦٨١ | سێ پا ژوور زەمین چوار پا ژێرزەمین شلتی هەیەوپلقی هەیە وەرە سەیر شلق وپلقی کە؟ | مەشکە ژەندن |
| ٦٨٢ | سپیە مەلا نییە زەردە حاجی نییە کەسکە سەید نییە؟ | نێرگز |
| ٦٨٣ | سپیە شێر نییە زەردە زەردێنە نی‌یە شینە گیا نییە؟ | نێرگز |
| ٦٨٤ | سەری ئاسنە ، بنی دارە، ئەگەر نازانی شێتە مشارە؟ | مشار |
| ٠٦٨٥ | سورە باوێ چۆنەراوێ کەوتە داوێ؟ | مشك |
| ٦٨٦ | سندوقی دار دام لە دیوار بوو بە هەزار؟ | هەناری ووشك |
| ٦٨٧ | سەری سانە بنی قورئانە تۆ بیزانە؟ | کارگ - قارچك |
| ٦٨٨ | سەری ئێمەیە ، بنی نومەیە، لەکن خوشکەیە؟ | کەوشی پێی ژن |
| ٦٨٩ | سەد حەنك لەبان سندوقێك؟ | کۆڵەکە |
| ٦٩٠ | سپی‌یە وەکی کەشکی ، گۆی وەکو گۆی مشکی ، نە مشکە ، نە کەشکە؟ | گۆی شیتانۆکە |
| ٦٩١ | سەری گەورەترە لە هورگی؟ | مێرووله |
| ٦٩٢ | سەری شاخە، نیسمی شێرە، قنگی کێرە؟ | کەڵەشێر؟ |

